شیعر

# سحوری بەرەکەت

ئەیوب عەنەبی

چاپی یەکەم رەمەزانی ١٤٣١ك - ٢٠١٠ز

ناوی کتێب: سحوری بەرەکەت

ناوی نوسەر: ئەیوب حەمە حەمە رەشید (ئەیوب عەنەبی)

بابەت: شیعر. سۆزی ڕەمەزان ـ موناجات و پاڕانەوە

کومپیوتەرو تایپ: مامۆستا پەیمان عەبدوڕەحمان

دیزاینی بەرگ و ناوەوە: ئەکرەم فەرەیدون

چاپخانە: چاپەمەنی سیما ـ سلیمانی

تیراژ: (١٠٠٠)دانە

چاپ: چاپی یەکەم

لە بەڕێوبەرایەتی کتێبخانە گشتییەکان - سلێمانی

ژمارەی سپاردن: (١٦٠٤ )ی ٢٠١٠ی پێدراوە

# پێشکەشە بە.....

* خوێنەرانی.......
* دایکم، سێ ڕەمەزانە لە قیامەتدا گوڵی بەرهەمی مەغریبی بەختەوەری و سحووری بەرەکەت دەچنێتەوە.
* باوکم، هەمیشەو هەردەم پشتیوانمە .
* براو خوشکم کە لە ناخیاندا دەژیم و لە ناخمدا نەژین.
* نیشتمانەکەم، یەکەمین زادگام.
* نما و دیما دوو شاباڵی رۆحی زیندووم.
* هاوسەری ژیانم.
* ئەوانەی کە لە دەرگای ڕەییان دەچنە ژوورەوە.

# پێشەكی

ئەم بەرهەمی برای شاعیر و پەخشاننوس كاك ( كاك ئەیوب عەنەبی)م خوێندەوە هەستم كرد لە خەیاڵدانێكی قووڵ و هەست و ئیحساسێكی لێوان لێو لە عیشقی ئیلاهییەوە هەڵقوڵاوە و پڕە لە سۆز و گوزارشتی راستەقینەی كەسێك هەڵوەدای چێژی مەعریفە و عیرفان بێت، بە تایبەت كە ئەم پەخشانە شیعرانە بۆ مانگی سۆز و بەرەكەت مانگی سەبر و مەعریفەت، مانگی ڕەمەزان گووتووە، كاتێك ڤێرسەكانی ئەم بەرهەمم دەخوێندەوە كە بە شێوازێكی شیعری رێكوپێك و وشە و تەعبیری بزوێنەر دایرشتوون ئافەرینم بۆ سەلیقەو قەریحەی پاكوخاوێنی ئەو دەكرد و شانازیم دەكرد بەم رابوونە ئیسلامییە هەڵكەوتووەی كوردستان كە گەنجی ئاوا غەزەلخوان و وشە پاراو بەو ئەوین و ئیلهامەوە كەوتووەتە چڕین و لە گوڵزاری ئەدەبیاتدا رێبازی مەولەوی و مەحوی و نالییە مەزنەكانی گرتووە و بۆ نەوەی نوێ ئەدای پەیامی خۆی دەكات.

بۆیە بە پێویستمزانی بەم چەند دێڕە ئافەرین و دەستخۆشی لەم برا شاعیرە بكەم و هیوای سەركەوتنی گەورە و هەنگاوی بڵندتری لە پەروەرگاری داهێنەری عیشق و ئەوین بۆ بخوازم ئەوەشمان لە یاد نەچێ كاك ئەیوب بەم بەرهەمەی توانیویەتی داهێنانێك لە بواری موناجات و ئەدەبیاتی عیرفانی كوردییدا پێشكەش بە كتێبخانە ئەدەبییەكەی رابوونی ئیسلامیی لە كوردستان بكات، هەر بۆیە گەشبینم بە داهاتووی ئەم رەووتە و لە خوای گەورە تكاكارم كە هەمیشە و بەردەوام و سەربڵند و بە ئەنجام بێت.

**دكتۆر سەباح بەرزنجی**

**١ شەعبان ١٤٣١**

# پەیامی ستایش

پەیامێك كە تەنها پڕە لە شوناسی سوپاسگوزاریی و نامەیەك كە تیایدا وێنەی خۆشەویستەكانم نیشان دەدا،هەگبەیەك هەمیشە پڕە لە وەفاو پشتیوانیی، سەرنگەرێك لێوانلێوە بۆ بەرگری و موقاوەمەت، سێبەرێك كەلە گەرما دەمپارێزێت، گوانوویەك كە نایەڵێت سەرما بمبا، ئەم ستایش نامەئاراستەی هەریەك لە بەڕێزان: (پرۆفیسۆری یاریدەردەر دكتۆر سەباح بەرزنجی، شوان هەورامی، كاوە پێنجوێنی و مامۆستا ئەكرەم فەردیدون، مامۆستا پەیمان عەبدوڕەحمان) دەكەم خوای گەورە پاداشتی بەخێریان بداتەوە.

**نموونەیان زۆربێت مۆفەق و سەركەوتووبن.**

**ئەیوب عەنەبی**

# یەکەم ڕۆژ

سالێکە لەدەریای سەرکەشی نەفس دا
سەوڵ لەکەشتی گومان لێدەدەم و
لەودیو لاساری بونمەوە
لەپشت وورتە وورتی یارییە دۆڕاوەکانمەوە
بەڕەشماڵە فراوانەکەی ڕەمەزاندا خۆم دەتەکێنم
لەویقاری مەغریبی بەختەوەریدا سوکنەت دەدەم
پشـو دەدەم و
لە سفرە ماڵە بەرائەتیەکانەوە ئەنوارمە
سەر دارسنۆبەرەکانی سەوزی تەمەن
سالێکە دڵمان ڕاگیراوە بەبارانی میهرەبانیت و
وێنەی زەوی دێم و دەممان کراوەیە بۆهەناسەت
تا لەنێتی ئەم کەسکبونی تەمەنەدا
ڕۆژانە نەمامێك بۆژیان بنێین
ئەزیزم... سالێکە ڕۆحمان بۆتەبەردەبازی
خێروبێری ئەم نیگایەت
تالەئاپارتمانی سەعادەتدا ئاسمانێك لەکلودبەفری
خۆشەویستی ئەم مەهتابە دروست کەین
ڕەمەزان.. من ئێستا لەبەردەم چیرۆکەکانی

بەربانگ و پارشێوتدا دەست بەنزا و
قامکم بەقەڵەمی پڕنوری مانگت
وشەبەووشەی نەزیهی تۆ
لەگوڵدانی شیعری خۆما ئەشۆم
تاخودا لەبەرکەرەمی خۆی وخۆشەویستی ئەم مانگە
ئاوپڕژێنی دڵمان بکات و
ئۆخژنێك بەسێڵاوی تەمەنی تاریکیماندا بدات
بەڵێ ئەزیزم.. ساڵێکە چاوەڕوانی
گەڕانەوەی سەفەری پڕخێرتین
بۆهەیوانی سەڵاو ئەشکەوتی پڕنوری وەحی
تالەئاوێنەی ڕۆژ ژمێری ڕۆژانەکەمدا
هێمای ڕاست لەبەردەم کاری خێرو
هێمای چەوت بەسەر گوناهدا بێنم
سەفەرێکە ساڵانە بە نورەو ڕێدەکا و
بەسروشەوە لە کۆتاڕۆژی مانگدا
حەلقەی زیکری پەڕاوێك خۆش ئەکا
کەلەدوای نوێژی سپێدەی یەکەمدا
وێنەی ڕێحانە بۆنی خۆی پەخش دەکا و
لەئێوارەی خەندەی بەربانگا
چەند بە میهرە ئەم صاحبی کەماڵ ساڵە و

چەند بەشووشە ئەم نیگای سفرەی ماڵە
خودا لێمان وەرگرە ڕۆژوی ماهی موبارەك
ئاوپڕژێنی دڵمان بکە بە سەعادەت
ڕەمەزان تۆدنیایەك پیری گەنج دەکەیتەوە و
دنیایەك گەنج دەبەیتەوە بۆژێر سێبەری میهری خۆت
تابۆنی وەنەوشەکانی منداڵی بکات و
گوێمان پڕکا لەسەلای ئەم پارشێوی حەیرانە و
سنگمان بکاتەوە بۆتەوژمی خوداپەرستی و
پێبنێن بە قیژەی جەنگی ئەم خەتای نەفسە
بەخێرهاتی ئەی مانگی بەفری هەرەسی گووناهوو
ئەی بارانی مروەتی ئاسمانی ساڵ
ئەی ڕیشۆڵەی جوانی سەردار ئێلەکان
ئەی پارشێوو تەراویح بەربانگ ونوێژ وقورئان
خودا قبوڵی کالێمان مانگی ڕاپەڕین بەسەرتاوان

# دووەم ڕۆژ

دووەم ڕۆژ لەبەر میحرابی مزگەوتا
لەبەردەم سکونەتی ویقاری مانگ و
لەگۆڕستانی گوناهەکان هەڵدەڕوانم
لێرە.. لەمەسکەنی ئاوێتەبوون بەخواوە
لەمەوکیبی زادەی پڕخێری ساڵەوە
لێرە..لەگومەزی موحەرکی جەماعەتی تەراویحەوە
لێرە لەسەرسفرەی عەشق وئەوینی مانگەوە
دنیایەك جوانی .جیهانێك منالّی
غەیبوبەیەك لێوان لێو لەئاشنایی
مانگێك لەمێژودا پیرو لەساڵدا گەنج ولەخۆیدامناڵی دێنێت
بۆنی وەنەوشەکانی بەبۆنی حونەینی لێدێت و
مێشکمان بەسرودی (اللهم لك صمت) زاخاو دەداو
گوێشمان لەتەهلیلەی ئەڵقەی زیکری شەوانی مزگەوت پڕدەکات و
زمانمان بە دروشمی (إنی صائم) بەرئەدا
ڕۆژو ئەی زمانی منالّی وعەفواتی خوای
مانگ.. پەپولەمان بەچڵە نێرگزی خۆرئاوابوندا هەڵدەفڕاند و
لەبنارەوە تادەگەشتینە سەرلوتکە، ماچی ئەم گەلاَیانەمان دەکرد
کە لە ئەزەلەوە بەشەونمی خوا تەربوون و

لە پێگەی ئیسلامناسیدا پەیامبەرێك
بەئەمانەتەوە ئەم ڕسالەی بۆ هێناین
تائیمەش..لەدەریای ئەم سۆزو میهرەبانیەدا
دلۆپێك لەئاوی ڕوونی ئەم شەریعەتە هەلگوزین و
بەرسێبەری ئەم مانگە بکەوین
کەخودا حۆی پاداشتی بۆداناوەو دەیداتەوە
دەهرێکە .. بەدارچنارەکانی میحرابدا هەڵدەزنم و
عەقڵم پێم دەڵی نەوجوانی جوان هەستە
خۆت بەئاوی نەزیهی ئەم دەریایە بشۆ
خۆت پاککەرەوە لەچلکی ژیان
وەرە سەرکەشتی بڕواو
سەوڵ لێبە وبەرەو کەناری ڕزگاربوون و کەمەن بگرە و
لەکەمین بە بۆ لەناوبردنی ئافات
وێنەی مەرهەم بڕژە سەرپۆرەترەیتی زامەکانی نیشتمان و
نەزیفی گوناه وشکە
ئەزیزم.. بەخێرهاتی ئەمجارەش
وەك سالآنی دی بۆنیشتمانی جوان
بۆسەر گەلآوگوڵ وقردێلەو دارئەرخەوان
هاتیت وخۆدەگەیەنیتە هەموو جێگەیەك بۆ بەختەوەری
لەسەر ڕێگا حازری

لەمیحرابی مزگەوتا ئیشکگری
لەسەر کیلی ئاو ئەنوسی
لەسەر جەنازەی تاواندا هەرەسی
لەبەرماڵی سەرای نگینی هەڵبەستدا سینارست وهەم ئاوازی
تۆئەو مانگەی تاپیر بی جوان ئەبی
ساڵی جارێك زەنگ لێ ئەدەی
زەنگی بەخۆداچوونەوە
زەنگی خۆشەویستی بەبوراقی موحەمەدی
ڕێ لەو شەمشەمانە ئەگری
ئاسمان بەتاریکی ئەتەنن و
خۆر بەبەری بێژن ئەگرن
تۆئەو مانگەی ساڵی جارێك
بەرهەمی دارەکان ئەچنیتەوە و
بەخۆرنشینی موحیبەتی خواوە بەرەو ئاسمان ڕێدەکەیت و
لەهەگبە کریستاڵیەکانی خەزنەدا
مۆم دەکەیتە شوناسی خۆت بۆلێواری ڕۆژی حەشر
تۆ ئەی مانگ ئەی مەعشوقی دەم ودەهر

# سێ یەم ڕۆژ

بەخێرهاتی گوڵیساڵ
گوڵەکەی چوار وەرزی نیشتمان
نیشتمانی نێو هەساران...عاشقانی مانگی ڕەمەزان
ڕێحانەی سەر سفرەو خوان
ئێستا چ ناسکی لەکەنار دەریای بێدەنگیەوە دێیت و
لەسحوری بەرەکەتی ئێوارەدا دەڕوانی
وەك نەسیم جارێك لەسپێدەو جارێك لەمەغریبدا ئەمناسی
بەرەو مێرگی نزا دەڕوانی ولەشکری گوناه ئەسوتێنی
هاتیت وبەم ئاشنابونەت مت بونت کردەدیاری تاوان
لەبەردەم شۆڕشێکداولەشەوێکدا
سێ ڕکات نوێژی ویترت دەخستە نێو هەگبەی ڕۆژانەت و
بەدەم تەهلیلەوە حەواڵەی خوات دەکرد
بێ تۆ نە شەومان شەو ونە ڕۆژمان ڕۆژی خۆشەویستی بوو
کات بەفیرۆ ئەچوو..
هەموو شتێك لەکات وساتی خۆی دەرنەئەچوو
ڕەنگەکانی خۆشەویستی و وێنەکانی موحیبەت
تەنها لەتۆدا دەبینران ولەتۆدا پشویان وەرئەگرت
گوڵی ساڵ..لەبوێری دارەکان ڕائەما و

له بیست و چوار کاتژمێردا
پێنج نزاو یەك بەش لەپەیامی ژیانیان
دەکردە توێشووی تەمەنیان
من دەمگوت عاشقانی ئەم مانگە هەموو ساڵێك ڕەنگێك ئەگرن
هەموو ڕۆژێك تابلۆیەکی نوێ ئەکێشن
هەموو نوێژێك نوچێکی جوان بۆخوا ڕائەخەن
هەموو نوچێك خودا تاوانێکیان لێ ئەکاتەوە و
ئاسۆیەك بەبەریانا هەڵئەدا
خوایەگیان چ مانگێکی خۆشە لەساڵدا و
چ ڕۆژێکی گەشە لەتەمەندا و
چ تەمەنێکی ناسکە له ڕۆژوودا
ڕۆژوو بوئرە پەخشی نەخشاندنی دڵەکانە بۆخوا
گوڵەباخی بوێری ژیانە بۆئەو
بارانی خۆشەویستی یە لەشەودا ئەبارێت و
لەڕۆژدا گوناهەکان ئەشوات و
پرچی دارئەرخەوانەکان ماچ دەکا..تالەلێزمەی لەزەتی ئەو بگەن
ئای خوایەگیان چەند خۆشە ساڵی جارێك
ئەم مانگەدێنیتەوە ناومان و
دەیکەیتە میوانی هەموو ماڵێك
هەموو ماڵێکیش لەم میوانداریەدا پێشبڕکێ بۆجوانی دەکەن

جوانی ڕەوشت  جوانی ڕێز جوانی نوێژ  جوانی نزا
جوانی پاڕانەوە وصەفا  جوانی بوێری وڕاستگۆیی ..جوانی
نیشتمانی ئاوی
جوانی لەخوداپەرستی .. جوانی عەشق وخۆشەویستی
جوانی لەجوانکردنی ساڵ  لە جوانی لەتەمەن  لەقوربانی دان
جوانی لەملکەچی ئیمان  .. جوانی لەمانگی گوڵی ساڵ
جوانی یەکڕیزی وتەبایی ..جوانی برایەتی ئیمانی
جوانی شەرم حەیای ژیان .. جوانی ئارامگرتنی گیان
جوانی بەوەنەوشەی زمان  .. جوانی وەك خۆی مانگی ڕەمەزان
جوانی بۆجەستەی ڕۆژوەوان ..جوانی بۆکردارو ڕەفتار
هەموو جوانیەکانی ژیان  لەتۆدا دەبینرێ ڕەمەزان
خودا بەنوری پاکی خۆت بیشۆ گەردو تۆزی گوناهمان
تەرکە جەستەی وشکمان  بنەخشێنی نوری ئیمان
لەنێوچەوانی عەبدەکان
لەبەرخاتری مانگی قوورئان
مانگی قەدرو تەراویح وقوربانی دان
خودا پیرۆزی کە لێمان
بمانگێڕە لەموسوڵمانانی پێشینەمان
لەبەرخاتری پێشەوامان
(مـحمـد )هەزاران صـــڵاْ وات

# چوارەم ڕۆژ

چەند بەمیهرە ئەم هاتنەت
گوڵستانی چ مێرگێکە ئەم پەلکانەت
ئەشکی چ دەم وچاوێکە ئەم بارانەت ...
کەزبەی چ خۆرەتاوێکە ئەم نیشانەت
هاتیت . بەهەوری بارانێکی پڕنەرم ئەباریت و
دەوارێك لەئومێدی هەڵدەدەیت
وێنەی دڵ ...دڵی عاشق ..دڵی ئولفەت بێ شك دڵ
تۆسەیرکە .. چۆن ئەم لەشکرەی خودا دێت و
بەخۆشەویستیەیوە بەعەشقەوە
بەجوانییەوە بەڕەوشتەوە ئەبارێت و
ئارام ئارام بەهێمنی یەوە ڕێدەکا و
یەك ڕەنگ یەك ڕەنگ بەئاوازێکەوە
یەك دەق ویەك تێکستی شعری
بەلآم بەچەند شاعیرێکەوە
یەك سیناریۆ بەلآم بەچەند دەرهێنەرێکەوە
نمایشی تۆ لەسەر شانۆی ژیان ئەکەن
دەزانی دڵم تربە تربی چەندان دڵە کە بانگت ئەکەن
دەزانی چاوم تێڵە تێڵەی چەندان چاوە کە تۆدەناسن

دەزانی گیانم هەستکردنی چەندان
هەستی گیان هەستت پێ ئەکەن
هەناسەی چەند شۆڕەسواری ڕێبواری دور بانگت ئەکەن
چەندان تیغی زمانی گوڵ هەسان لەناوی تۆ دەدەن
چەندان قەڵەمی ڕاستگۆی ژین ناوی پیرۆزت تۆمارئەکەن
ئای خوایە گیان... خوای زەمین وئاسمان
خوای مانگ وساڵ خوای دروستکەری جیهان
خوای کردکاری جیهان ..
سروشتی جوانی ڕەنگەکان
ڕەنگی ویساڵی ڕەمەزان
نیشتمانی ئاوی قورئان
فیردەوسی شاهی بەهەشتان ـڕۆژووەوانی دەرگای ڕەیان
بیرم دێ لەمێژەوە ساڵی جارێك تەمەنی خۆم بۆشیعر دادەنێم
شیعر بۆ خۆشەویستی خوا .. شیعر بۆ مانگی پڕ هیوا
شیعر بۆلەدایك بونی خۆم .. شعر بۆ ڕۆژی فرقان
وەکو باران لەسەر زەوی ڕەقنا دەباریم وتەڕم ئەکرد
ڕێنمایی بەهەشتم کەی خوای میهرەبان
لەبەردەم ئایەتەکانی تۆدا سوژدەیەك بەرم و
زەمزەمییەك ئاو بۆ تەڕکردنی گەرووم ئامادەکەم

دەستت گرتم تانەکەومە ئەو ئاگردانەی لەخودی ئینسان
دروست دەبیت
فێرت کردم چۆن پێنوسەکەم بەمرەکەبی سورەتی پەڕاوەکەت پڕکەم
چۆن؟ بە مانگی میهرەبانی ڕەمەزانت قسە بکەم
چۆن؟ بەلێوی ووشکی ڕۆژو درودوو سلاّوات بنێرم
چۆن؟ بەچاوی پڕئەسرین تاوان بشۆم
فێرت کردم چۆن قەڵمی چاپوك وجوان
لە سێبەری مانگی قورئان بهێنمە گۆو
شعرستانێ بکەم بەدیوان
دیوانێ بۆ بەربانگی ئێواران شنەیە بۆ ئارامشی ژیان
بخوردێ بۆ سکونەتگای نیشتمان
نیشتمانێ پڕبێ لەنووری قورئان
ئیستێك لەبەردەمی ژیان
بەتۆوە خۆشە ڕەمەزان
ئەی سەرچاوەی چاکە خوازی موسوڵمانان
نیهالی عەشق وئەوین مانگ وساڵ
بەخێرهاتی مانگی قـــورئـــان

# «ڕۆژی پێنجەم»

لەساڵێکدا مانگێکمان بوو

هەموو ڕۆژەکانی عەشقی تیادا دەخوێنرا

عەشقی ئیلاهی ..عەشقی پارشێو وبەربانگ

عەشقی بەزدیی ..عەشقی خۆرو مانگ

چەند خۆش بوو ڕەمەزان .. لەمەسکەنی قوربانی دان

لەبوئرە نەخشاندنی سامانی ساڵ

لەڕەنگەکانی خۆشەویستی

لەزیکری پەنهانی قورئان

لەحەڵقەی چەهچەهەی ووتار

چەند بەمیهر بوو مانگ  چەند ئازیز بوو ڕەمەزان

چەند بارانێکی بەڕەحم بوو ،نمەی لێزمەی صەدەقات

چ بۆنێکی خۆش بوو  شەوانی یاقوتی ساڵ

چ هێزێکی مەعریفە بوو بۆ ڕۆحی ئێمان

چ لەشکرێکی خواناس بوو بۆشکستی تاوان

چەند وەنەوشەیەکی مێرگ بوو بۆئەهلی زەمان

ئای لەڕەمەزان ..گەردو تۆزی سەر دڵی ئیمەی فڕان

چەند سەرسوڕهێنەر بوو ئەم مانگە

کەرنەڤاڵی چ گوڵێکە ،بەدوای تەرمی دڕکاویدا دەگەڕێ

بارانی مەزرایەکی سەوزە بەسەرماندا خوڕەم دەکا
بێ گومان لەچۆلەکەی خۆشەویستی ئەچێ
لەبەر دەرگای ئیبراهیمێکدا تەوێلێك لەسەر زەوی نەخشەبێ و
ئیسماعیلێك بەئەوینەوە ڕەنگ ئەگرێ
ڕەمەزان ..ئەی فیردەوسی ئاکارەکان
پەلکەزێڕینەی ڕەنگەکان
ئەی گیانی لە خێر خولقاو
ئەی نەزیهی ڕەنگاڵەکان
تۆبوی بە وێنەی لوقمان
حەکیمانە ئامۆژگاریت ئەکردین و
موسا ئاسا ئەڕژایتە نێو نوری خوا
تۆبویت لەقیبلەنمای ڕەنگەکانتا
بەرماڵی جوانی نزات بۆئیمە ڕادەخست و
شەن وکەوی کردەوەکانمانت دەکرد
کەوابوو ئەی گلێنەی بینینی سەدا
وەك ئاو بێ ڕەنگ وبێ بۆن
وەك بەهەشت سەوز ،وەك میوەهات بەتام و
وەك وەنەوشەی ماڵی دڵ شەلاڵی گۆرانی صەفای
کەوابوو هێمن هێمن لەگەڵ ترپەی دڵماندا وەرە
ئاشنای زەیتونێکمان بکە کەسەرما لێینەدابێ و

لەمیمبەرەکەی خۆی دا جارێك نەلەخشابێ
بۆئەوێ ئەو دەمەی دێ
من لە ژوورەکەی خۆما نغرۆی شعرێك بم بۆتۆ
کە گوناهم ڕامالێ و لەوسەری ژیانەوە
ئاسودەمکە بەپەریەکانی بەهەشت و
ڕەشمالێ جوانی خۆی لەگەردنم بئالێ
تا منیش بەپەنجەکانی ئەوینەوە
(٣٠)سی کۆپلەی شیعری نوێ بۆسالێ نوێ بنوسم
ئەزیزم کەتۆ هاتی من بۆنی گولێکی بۆنخۆشی دەکرد لەنزیکەوە
وەك حێل و مێخەك مەستی تۆی کردم و
لەنیشتمانێکی ئارامدا مەنفام کوشت و
کراسی سپیم لەبەرکرد وتا چی دی نەگەڕێمەوە بۆ ڕەنگی ڕەش
ئای ڕەمەزان ..
چەند عەترێکی گرانبەهابووی بۆ جەستەی هەمووان
چەند ئاوێکی پاك بووی لەنێو ڕێگای گۆزەکان
چەند ڕوبارێکی هێمن بووی بۆ مەلەوانەکان
چەند کارئەکتەرێکی سەرکەوتوو بووی بۆ بۆخاوەنی سیناریۆکان
بەخێرهاتی مانگی قورئان ....
خێرت پێ بێ بۆ ئادەمییان

# ﴿ڕۆژی شەشەم﴾

هاتی ولەسەتاپای جیهاندا
وێنەی پەڵەهەورێکی پڕباران باریت
لەهەموو گۆشەیەکی ئەم زەمینەوە
شینایت کردەکەفاڵی سروشتی گۆڕان و
پەلکە زێڕینەی عەشقت هۆنییەوە و
لەبەردەرگای ماڵەکاندا هەڵتواسی
تۆ ئەی خۆشەویستم مانگ
هاوڕێ و هاوسەفەری کاروان
ئەی پێنوسەکەی بەرگیرفانی سەکۆی باران
ئەی مەعشوقە ئەبەدییەکەی پارشێوکەران
هاتیت و بەددم تەهلیلەی ئەم زیکرەوە
سوکنایت گەیاندە جێ و
تەوێڵی ئێمەت لەخۆڵ مارەکرد و
دەستەکانمانت بەبەری ئاسمانا هەڵواسی
فێرت کردین چۆن ڕێ بکەین؟
چۆن سلاو لەیەکتری بکەین
چۆن حەڵاڵ کراوەکان حەرامکەین
هاتیت و بەسەدایەکی نوێ وە و

لەجیهانێکی نوێ دا زەنگی هۆشیاریت لێ دا
قوتابیانت فێری وانەی داهێنان ولێبوردەیی و
ئارامی ژیان کرد
تالەبەردەم هەر ڕووبەڕوو بونەوەیەکدا ..
هەر هەڕەشەیەکدا
بەتفەنگی تۆ بەفیشەکی تۆ
بەرگری لەخۆیان بکەن
هاتیت وبەدەم دوو زیکری نوێوە
شەوانە ئاواز بخوێنی و
ڕۆژانەش سیناریۆ بۆحیکایەتی
ئەم مانگە بکەیت
تالەمروەتگای ئەندێشەی مرۆڤدا
زیهنی کۆمەلگایەك سەوزرێژکەیت و
ئەم گێتی یە بەریتەوە بۆ سەردەمی پێش پیس بوون
ئەزیزم ئەی مانگ
دەهرێکە بەدوای سێبەری تۆوە هەنگاو دەنێم و
بەرەو حەقیقەت ڕێ دەکەم
تابتوانم نەسیمی خۆشەویستی خۆم
لەتۆدا تەرکەم
دەمێکە سواری پشتی ڕەشەبا بووم و لێناگەڕێم

تابەسەر چیای حاڵی بوونی تۆدا سەربکەوم و
لەوێ لە لوتکە سالأنە مەشخەڵێك
بۆ کوژاندنەوەی تاریکی هەڵکەم
ئەزیزم ئەی مانگ
ئەی چەهچەهەی دڵی نازدار
ئەی تەوژمی گۆڕان وبەرخودان
دەزانم گەرتۆ نەبای
کەس بەردەرگای خۆی نەئەگۆڕییەوە بۆت و
کەس فێری وانەی عیشق نەدەبوو
تـۆ نەبای
کەس گۆزەی پڕ نەئەکرد لەئاو
ڕێبوار تینوێتی خۆی لێ نەدەشکاند
تۆنەبای
کەس ئەم سیمبولی ساڵەی نەدەناسی و
ئەم خەلأتەگەورەیەی پێ نەدەبەخشرا
تۆ نەبای نە ئێمە ناوی پارشێیو و بەربانگ و نەئەوانیش ئەیانزانی
تۆنەبـای
کەس کاسەی خۆی نەئەگۆڕییەوە بۆ گۆڕان
تۆ نەبای
ئەم چرایە وانەدەسووتا و ئەم ڕوناکییەش لێرە نەدەبوو

# حەوتەم ڕۆژ

لەمەرکانەی خۆشەویستی پەیامەوە
بایەك هیمن هیمن
بارانێك پەیتا پەیتا
لەئاسمانی ئەم گێتی یەی مندا
ماهێك دەم بەزیکرو دەست بەنزا
زەنگی بێداری ڕۆژێکی ئەبەدی لێ ئەدا
هۆ ئەی مانگی خۆشمرور و
ئەی نیهالی جوانی سروشت
سالێکە بەدەوری ئەم زەوی یەدا
کاتژمێرئاسا میلی خۆت بائەدەیت و
لەگەڵ دەرکەوتنی یەکەم وێنەی داسا
بەڕەحمەتی خوا ئەبارێت وگوڵ ئاسا
لەباخچەی هەمووماڵێکدا ئەیکەی نما
دێیت وبەدەم قنوتی مەرحەباوە
تەراویحمان لەگەڵ دەکەیت و
لەدڵی نیەتێکی گەورەوە
ڕۆژانە دەژمێری و
بەدەم زیکرێکی ئەرخەوانی بەختەوەرییەوە

شێوان بەربانگمان لەگەڵ دەکەیت و
ئەلقەیەك لەکۆی ئەو سێ ئەلقەیە پێش کەشئەکەی (٣٠) سی
تۆ ئەی مانگ وەك شایەتحاڵێك
لەنمایشی ئەکتەرێك ئەگەڕێی
کەحیوارەکانی وێنەی دەق بەرجەستەی کردبێ
تابتوانێ تاجی ئەوشەرەفمەندیەی لەسەرئەکەی
کەلەدەرگای ڕەیاندا پێشوازی لێ دەکرێت و
لەبەردەم خواوەندا پاداشت دەبینێ
مانگ ئەمە یەکەمین حیکایەتی نمایشە
یەکەمین ئەلبومی یادەوەری یە
کەمرۆڤ دێنێتەوە پیش چاوی خۆی و
لەهەموو گۆشەیەکی حەیاتیا
کەناڵێك لەبیرەوەری ئەکێشێ و
دێڕێك لەمێژوی خۆی ڕەشئەکاتەوە
مامۆستام ئەی مانگ خۆشەویستم ئەی بەربانگ
دەزانی گەرتۆ نەبای
کەس ئەم دیوەخانەی پڕنەدەکردوو
منیش هیچ پاداشتێکم وەرنەدەگرت
تۆ نەبای ئەم میحرابانە خەم دایدەگرتن و
مەلاکانیش بێ حەوصەڵە دەبوون لەپێشوازیت

تۆ نەبای کەس قەدری پارشێو وبەربانگی نەدەزانی و
تەنها فاتیحەیەکی نەدەخوێند بۆ ئاسودەیی
ئەزیزم بەر لەهاتن چاومان ئەبلەق بوو بوو بۆدیدارت
دلْمان لێی ئەدا بۆسوکنایت
دەستمان بەدەم تەهلیلەی غوفران وبەخشینەوە
بەرزدەکردەوە بۆغوفرانت
تالەبەردەم مالْەکەی خوادا
ئەم ئەستێرە شایەتی بداو هاوارکا
مرحبا مرحبا
یاشهر رمزان مرحبا
دواپەیامی خۆی بهێنێ ولەسپێدەیەکی نوێدا
پەنجەی شاهیدی بلْندکا
ئیدی ئەوسا خودا
لەبەر ڕایەخی مالْی دا
نیشتمانێك لەئارامی و
دەوارێك لەئومێدی بۆ هەلْئەخا

# ﴿هەشتەم ڕۆژ﴾

هەشت شەوە لەباڵەخانەکەی تۆدا

لەهەردوو ژووری پڕخێرتا ئێواران وپارشێوان سکونەت دەدەین

لەگەڵ تۆدا سەرێ لەماڵی خودا

لەگەڵ تۆدا بەکۆڵانەکانی نەسیمی بەختەوەریدا ڕێدەکەین

لەگەڵ تۆدا ئەم مانگە (٣٠)سی دڵۆپ فرمێسکی خۆشەویستی

بۆخوا ئەڕژین

هەشت شەوە لەگەڵ تۆدا هاوڕاین وبەردەوامین

بەردەوام گوناه لەسێدارە دەدەین

شەوی نوتەك هەڵئەواسین و لەبەردەم

پەنجەرەی ڕووگەدا کڕنوش ئەبەین

خۆمان بۆسبەی ئامادەدەکەین

بەدوو باڵی جوانی سحورو ئیفطاردا هەڵئەزنێین

دەچینە سەر لوتکەی هیوا

لەوێ لەگەڵ ئاسۆدا خۆمان نمایش ئەکەین

تۆدێیت وئێمە ئەڕۆین ئەم بەردەوامییە

لەئێمەدا بەختەوەرو لەتۆدا خەندە دێنێ

لەبەردەم پێی تۆدا دەبینە جۆگەلەئاوی باخچەیەکی جوان

ئەبین بەکۆڵی پڕتوێشووی چارۆگەی پڕنان

دەبینە شعرێکی بەرئاگردانی کوانوی نالی
لەمەحویا ئەتوێینەوە ونزائەکەین
خودایە بەلوتفی خۆت بمانبورە
لەبەردەم پەنجەرەی هەتاوی خۆتا فێرمانکە
خودایە ڕۆحمان تێکەڵکە بەفیردەوسی مانگت و
چاومان تیژڕەوکە بۆ دیدارت
لەم مانگەدا هەموو قوربانییەکی حەزمان ڕژاوە بۆت
ئەی میهریاری ماهی موبارەك
دەزانی لەمەعشوقی تۆدا ئێمەی خەتا
ئێمە گەواڵە هەوری باران
باران بۆ ڕامالێنی تاوان
لەخاکی تۆدا دەڕژین
هاتوین عەشقی تۆ پەیامی تۆ
جوانی تۆ  بەختەوەری تۆ لەبەرکەین
شەمشەمەکانی ژیان بکوژین
دەم لەملی ئاسۆ کەین
دڵەکان پڕکەین لەسروودی ئیمانی
بەخشین لەڕێی خوا زۆرترکەین
هاتوین ئەی یار .. ئەی بەختەوەری ماهی ژیان
ئەی درودونزاکانی پارشێو وبەربانگ

ئەی نامە مزگێنی دەرەکەی خوای میهرەبان
دەزانین ئەی یار ... ئەی مانگ گەرتۆنەبای
ئێمە چیمان لەو هەموو گۆناهە بکردایە
کامە مەدالیای ڕێزما وەرئەگرت
چۆن ئەو هەموو دڕکانەمان بڕی
چۆن ئەو بەریانەمان بەست ونەمانهێشت
لێلآوی تاوان دزە بکا
خودایە ئەوە مانگی پڕ فەڕی تۆیە دێت و
ئێمەش یادگاری لەدایك بونێکی نوێین
خودایە ئێمە مانگت وشیعاری تۆمان بەرزکردوەتەوە و
تەڵەبی مەحبوبی خۆشەویستی تۆمان داواکرد
تالەنیگاری تۆدا ولەم مانگەدا
بەصیفاتی ناوە جوانەکانت
بەکلوە بەفری عەفوت لیمان خۆشبە
بەتابلۆ زیندوەکانی فیردەوسی خۆتمان شاد کە
بەخێرهاتی ئەی مەوجی ڕەحمەتی ساڵ
ئەی سەمای جوانی گۆڕان
بەهاری زیندوی ئادەمیزاد
بەخێرهاتی مورشیدی ئەهلی عیرفان
بەخێرهاتی مانگی قورئان

# ﴿نۆیەم ڕۆژ﴾

ئێمە لەساڵێكدا سی ڕۆژ قامەت بۆخوانی ڕۆح دەكەین
لەڕۆژێكدا لەهەموو سحورو ئیفطارێكدا خەندە دەمانگرێت
لەبیست و چوار كاتژمێردا پێنج جار گفتوگۆ لەگەڵ خودا دەكەین
مێزی حیوار گەرم كەین و پەشیمانی دەرئەبڕین
دەس لەڕۆشنایی ئەم مێژووەمان هەڵناگرین
بەدەوری مانگدا خول دەخۆین
خول دەخۆین ولەبانێژەی بەرەكەتیا ڕێسمەی تەبایی هەڵخەین و
بەدەوری شەشەلآنا لەگەڵ دەركەوتنی
ئاگرێكی دەروێشانە لەجێژوان گڕئەدەین و
بەسەر لوتكەی خۆشەویستیدا وێنەی بەفر ڕەشایی دەكوژین و
ئەوەندە عاشقتین بەكوێستان وگەرمیانتا ڕێدەكەین
ڕۆژی دووجار سەفەر دەكەین
سەفەری پڕخێری ئیمانی
یەكەم سەفەری پارشێوان كەپڕیەلەنهێنی جوان
جوانی نوێژی بەیانیان .. لەگەڵ ریزی فریشتەكان
قنوت و سوژدە بۆ پەروەردگار ئەبەین
لەگەڵ ویردی لااله الاالله وحده لاشريك له لەالملك وله الحمد
يحى ويميت وهو على كل شىءقدير

بەقەد ژمارەی پەنجەی دەست
دو دوعای پیرۆزی لەگەڵ ئەکەین
یەکەم پەنا بەئاگر ودووەم بۆچونە بەهەشت ئەکەین
لەم سەفەرەدا دوو سەفەری پڕ خێری خەندەی بەربانگ دەکەین
لەگەڵ خوانی رۆح سوپاسی خوا ئەکەین و
بەئەسپایی بەگوێی مانگدا ئەدەین
وەرمئەی دۆست وعەزیزم
ئەی رقیبی هەواو هەوەسم
وەرە لەحزەیەك فێری ئیستقامەم کە
بەماچێکی پەنا لەگەڵ خوا ئاشنام کە
بەپەیامێکی پیرۆز
پیرۆزی فروستادەکەم فێرکە
تالەودیوی نهێنی تۆبگەم وبەشمشاڵە سەوزەکەی ژیان
لەویقاری ئووردوی نێرگزدا
ئاوی بەهارێك هەڵکەم کەپڕبێ لەنهێنی
باخێ بدێرم پڕبێ لەهەنار
گوڵێ بۆنکەم تیایانەبێ ساڵ جگە لەتۆ ئەی مانگ
وەرە ئەی مانگ نازانی من چەند عاشقتم و
دەهرێکە بەئاوازی تۆ تەمەنی سەوزیم بۆدەگەرێتەوە و
دڵم زەریف زەریف سواری ئەسپی ژیان دەبێ وحیللەی دێ

هەستم لەتریفەی تۆدا تریفەی دێ و
ڕاوی ئەو ڕیشۆڵانە دەکا کەلەبەفرا جمەیان دێ
تالێرە نەبووی ئێمە نەمان دەوێرا ڕێبکەین
نەمان دەزانی متوربەی ژیان بکەین
گەڵامێو لەبەهارێکی تەڕ مارە کەین
نێرگزی تۆ بەپەنجەی شایەتومان گرێ بەین
هاتوین لەناو لەشی تۆدا سکونەت بەین
لەسەر جەستەی زیندووی تۆدا خۆمان هەڵخەین
بژاری گێڵگەی حەیاتمان کەین
لەسەر کێلی ئاوی تۆدا بەبارانی پڕنیازت خۆمان بشۆین
گۆزەی سەرە ڕێ پڕکەین
وەك پەروانە بەدەوری نووری زیوینتدا سەمابکەین
هاتوین ئەی مانگ لەگەڵ تۆدا دڵداربین
لەگەڵ تۆدا بڕوانین وێنە بگرین
لەشوشەی بۆنرێژی ئیلاهیت بۆنبگرین
بەشیعارێکی بەختەوەری ڕێگا ئەکەین
هاتوین تادوا دیدارت خۆشەویستی خۆمان
لەتۆدا دابەشکەین ئەی مانگ

# دەیەم ڕۆژ

ئەمێستا مانگ
ڕەنگی لەڕەنگی یاقوتی ئاو دەچێت و
خاکی گوناه ئەکێڵێت
ئێستا مانگ پڕدەبێ لەجەنگی بکوژانی گوناه
پڕدەبێ لەشیشەی کریستاڵی ساڵ
لێوان لێو دەبێ لەخۆشەویستی خوا
سەر ڕێژە لەماچی پەنا
ئێستا مانگ دە ڕۆژە لەدیوەخانەی ڕەحمەتی خوا
لەڕێواسی شاخی کویستانیەکانی خۆی دەڕوانێ و
بەبالآی دار سەوزەکانی پیری دا هەڵئەچنێ و
چەهچەهەی شیعرێکی نوێ لەبێدەنگی دا ئەڕێژێ
ئێستا مانگ وەك خۆی خاڵییە لەشەڕ
خاڵی یە لەدرۆ
پڕە لەوتەی شیرین وجوان و ڕاستگۆ
ئێستا مانگ بەعەتری خۆی
بۆنی سی ڕۆژمان لێ دەبینێ ودەمانباو
دەمانبا بۆئەودیو بەهاری تەمەنی جوانی و
وێنەی مناڵی تەمەنێکمان پێ ئەبەخشێ لەبەرائەت

بەرائەت بۆقڕانی وەرزی گوناھ
بۆخەزانی پیری گوناھ
ئێستا مانگ وەك پاشای ساڵ
بەڕەشماڵێکی فراوانەوە بەسرودی دوای عاشق بوون ڕێدەکا و
قەتار قەتار هەر هەموو ڕۆژەکانی
بەدەست نوێژەوە ئەشوا ..
غوسڵێك لەپیس بوونی یانزە مانگ دەرئەکا
بەسەر پەڕەی گوڵێکی شیلاوی دا
تك تك عەشقی خۆی تێدەکا
ئەمێستا مانگ وەك عەشقەکەی جاران
بەدەم خواستی دڵمانەوە دێت و
لەهەموو زەمانێکدا
دەڕژێتە نێو کاسەی بیرمانەوە
دەڕژێتە نێو خەرمانی ئێوارانی ئیفگار
دەبێ بەشنەی تازەی خەیاڵ
بەنێوچەوانی سپی یەوە هەڵدەزنێ و
لەڕووباری نوری خوادا
بەسەوڵی پەری خوازانەی
کەشتی ئیمان بەڕێدەکا و ئەمێستا مانگ
بەلاپاڵی ساڵەوە وورد دەبێتەوە و

بەمەستی شەرابی یاخیبوون پێ دەکەنێ
لێناگەڕێ تا هەموو گۆزەی ئەو خەیالآنە ئەشکێنێ
کەجامی سەرخۆشی پڕئەکەن
ئێستا مانگ هەموو ڕۆژێ
بەدەم چڵی نێرگزی بەهاری ژیانەوە پێ دەکەنێ
بەوەرزی شوشەی عەترفرۆشەوە دەبێتە کڕیار و
لەکتێبخانەکەی مەولەوی دا
شعرێك بۆ ڕۆژوەوان ئەکڕێ
لەگەڵ شەختەی بارینی ئەم بارانی ئارامییەدا
درەختی ژیان سەمەر ئەگرێ .. ئەمێستا مانگ لێناگەڕێ
بەئاسۆی دەم کەلی ڕێوە وێنەی هەتاو
هەتاوی بەژنی بەربلآو
لەبەردەم چرای چیهری شەوی چیا و
پرژنگی خۆی ئەلەرێنێ و
پرچی فێڵ ودرۆ ئەبڕێ
ئەمێستا مانگ لێناگەڕێ

# ﴿یانزەهەمین ڕۆژ﴾

لەتەفسی ماهێك ڕائەمێنم
کەسالآنە سی جار ئێوارەو بەیانی فێرمەکا
فێرم دەکاو ئەمداتەدەست ئەو گولآنەی
پێشبڕکێ بۆ جوانی دەکەن
جوانی یەك هێندەی تر مانگ ناوازەترو
ڕۆژیش خاوێن تر دەکا
ئەزیزم ئەی ڕۆژووەوان
وەرەو لەکانیاوی پڕ میهری عیبادەت
گۆزە پڕکە بۆ مالّت و
شەربەکان لێوان لێوکە بۆ دووری ڕێگات
ئەزیزم کەهاتی من لەبەر پێتدا
ڕۆژانە یەك جار شەوانیش بەهەمان شێوە
کڕنووشی سوپاسگوزاریت بۆ بەدیهێنەرەکەت دەبەم و
چەپك چەپك هۆنراوەی غوفران
بۆ سەفەری ئەبەدی ئەهۆنمەوە
کەهاتی خێرا دەستت دەگوشم و
نێو چەوانت بەتەوێلی خۆم ماچ ئەکەم
تا بالآم گیربێ لەبالآت و

لەسەر پێی خۆم ڕاوەستم
نەبادا دۆستێکی نزیك خۆم
کەوتنە نێو چاڵی حەیای بۆ هەڵکەندبم
لێناگەڕێم لەگەڵ هەنگاوتا .. هەنگاوو
لەگەڵ جولآنی لێوتدا نیگای خۆم
ئەخەمە سەر تەوێڵی تۆ
تالەدرەوشاوەی نووری ئیلاهی بگەم
لەگەڵت دێم
تابۆنی گوڵەکانی عیبادەت دەپشکنم
خێوەتگای سکونەت گەرم ئەکەم
نەفرەت لەهەوا وئارەزوو شەهواتەکانی مرۆڤ دەکەم
دەچمە ژێر داری زەیتون
شانی سنەوبەر ماچ ئەکەم
لەگەڵ تۆدا لەدنیای خۆم دەپرسم
تفی نەعلەت لەسەرابی هاوڕێی خراپ دەکەم
شەوانی قەدر بۆن ئەکەم
لەبیرمدا سەرێ لەبەدر وحونەین و
یادگاری لەهەڵوێستی هیجرەت ئەکەم
بەردەوام لەگەڵ مانگ ڕێئەکەم
لەگەڵ خێردا ئاشتی ئەکەم

لەگەڵ گوناهدا شەڕ ئەکەم
من ڕۆژانە وەك گوڵە بەڕۆژە
سەری ئەوینم بۆ حزووری ئیلاهی خۆم کەچئەکەم
بەڵکو خودا
بەمیحرابی پیرۆزیدا هەڵمواسێ
بەسورەتی پیری دا بمخوێنە
بەفەرموودەی ئیستیقامە بملاوێنێ
بەشدارم کا لەوشەوانەی کەسەر لەسوژدەدایە
بمداتە دەست ئەو قەڵەمانەی
کەلەهاتنی وەرزی تۆدا
پێشبڕکێ بۆپڕبوونی شوشەی تەراویح ئەکەن
بمبەخشە مانگ گەر نەمتوانیبا
کەمێك لەحزوورت ئیستێکا ڕاپەڕیم و
بەئەمانەتەوە ئەم قەصیدەم تەواوکردبا
بمبەخشە ئەی مانگ
لێم وەرگرە خودا

# دوانزەهەمین ڕۆژ

دوانزە شەوە
دوانزە ڕۆژە
لەبەردەم شەمعی نوری تۆدا
پێنوسێکی بەوەفام وقەصیدەیەکی عاریفانە ئەنوسم
تالەزیکری سادەی ژیانەوە خامەم ئیستێك بکا و
لەخەونی مێژوم سەوز کا
دوانزە ڕۆژە لەناختا گینگڵ ئەدەم و
سکڵی ویردێ گەشئەکەم
کەلەکوانووی ئومێدی پڕمیهرتدا
لەم حوجرەدا بەدەم هەنسکی بۆخوا سوڵحانەوە
قەڵەم بخەمە نێو قامکی شاهیدی دانەوە و
بنوسم ئێرە مەملەکەتی خۆشەویستی یە
ئێرە جێ ژوانگەی مەحوی یە
ئێرە سروودی عەسرێك خۆشئەکا و
سورەتی قەدرێك لەدایك ئەبێ
لەم میحرابەدا ، بەدەم زیکرەوە
خۆم خستۆتە نێو دەریای پڕ مرواری ئیمان و
لەگەڵ کاروان دا سەوڵ لەکەشتی ئارامی دەدەم

خۆم بەبالآی کتێبێکی نەورەسیدا هەڵئەزنێنم
کەرێگام بۆ ڕۆشنکاو
بەو بڵندیەیەوە ئاوازێکی لێ خۆشبوونم بۆبخوێنێ و
لەبەردەم پەروەردگاردا تینوی عەشقم پێ ستایشکا
ئەمشەو لەم سەربانی پڕ هەسارەدا
لەم باخچەی ڕازاوەی پڕ ئیمانەدا
لەم تدراسیۆنی دەنگانەدا
حەزم لەچرپەی گڕی فانۆسێکە
کەرازی عەشقی ماندوویم
لەشەوی نوتەکا شەنکا
ئەمشەو خۆم وقەصیدەیەکی غەریب
خۆم ودوانزە ووشەی بێدار
خۆم ومانگێك پڕ لە کەشکەشان
خۆم وسروودێکی سەوز
خۆم وعەسرێکی هیلاك .. خۆم ودوانزە گەلآی سەرخەڵف
خۆم ودوانزە هەناری گەییو
لەپێشوازی مەغریبێکی دەم بەخەندەدا دێینە حزوور
لەم ئێوارەیا
گۆزەیەك دوانزە جار پڕئاو ئەکرێ
سرودێ بەنەمری لەدایك ئەبێ

حەزی خەرمانی شەن ئەکا
لەپەنا ماچی پەناوە
ئەڵقەی کۆڕێکی نوێ ڕێك ئەخا
لەم ئێوارە وعەسرەدا
زیکرەکان کۆدەکاتەوە شعر بەدەست نوێژ ئەشوا
لەم مانگەدا ئەزیزانم
باچراتان هەردەم بگرێ
قەڵەمی کەسکی تەقواتان بابنوسێ
بەرماڵی شەوی بێدارتان ملی کەچکا
لەشەو نوێژێکا لەنگەر بگرێ
کۆڕی دەروێشانەی زیکرتان
باناڵەی دەفی پێوەبێ
باگەلاّتان زمانی ویردبێ
قەڵەمتان لەخشتە نەبرێ
لێوتان ووشك هەڵنەگەڕێ
هاوڕێم با لەناخی خۆت
ئاوێك بۆ تینوێتیت بگەڕێ
تاسەفینەی ڕزگاری جوانی ئەم مانگەی تیادا دەرکەوێ

# «سیانزەهەمین رۆژ»

ئەمێستا ئێمە لەسەر حەسیری تۆدا ڕاکشاوین
ئێمە تەزبیحێکی دەنك ووردین
بەئیمامی تۆوە بەستراوین
ئێمە ئێستا سیانزە ڕۆژە لەم عەیشەدا
ئیعتیکافی خێرو بێری قورئانین
ئێمە .. دراوسێ ی میحراب و
دۆستی ووتار و
عەشقی باران وبالندەی
بنمیچ ودارتێلەکانین
سومبولی خۆشەویستی و
سوارچاکی چیای ڕەمەزانین
هۆنەی مانگی پڕفەڕو قورئان
مانگی تەبایی وبرایی مانگی ڕەمەزان
سیانزە ڕۆژە لەجوانی ڕەنگت تێرنابین
لەئاوازی خۆشت هەلنایەین
تەنها بۆنی بوئرەیاقوتی دلتەکەین
کەچەشنی بەهارێك لەنێرگز
چەشنی هاوینێك لەمیوەجات

وەك پایز خەزانی گوناه

لەبەردەم کوانووی زستاندا زیکر

ئەمانە هەموو ...بێ سێ و دوو

لەگەڵ تیرەی مانگی زیونیت خول دەخوا و

هەرمەوسمێ بەڕەنگێ خۆی نیشان ئەدا

لەهەر وەرزێکدا سەوز

لەهەر ساڵێکدا سی ئەڵقەی زیکر

لەهەرکۆڕێکدا سرووديکی ئاوەدانی

لەهەر ڕۆژێکدا پێنج ووتار

لەهەر ئەلبومێکدا  سی وێنەی جیا

لەگوڵە گەنمی نەشئەی ساڵێکا

پڕ لەعیبادەت سەفەرەکا

مانگی نوورم

ئەمشەو لەخوێندنگەکەی تۆدا

چرای شەوی دەیجوور هەڵئەکەم

لەمەزراکەی تۆدا ئاوی ڕەیحانە دەدەم

ئەی میهرەبانی مانگ  لەم پارشێوی نزایەدا

لەم ئیفگاری دوری یەدا

لەم سەکۆی کڕنوش بردنەدا

دڵێ بێ تۆ بژی بێ لێدانە

ڕۆژی ڕوونی دەیجورستانە
ئاسمانی سەری گرکانێکی بێ ئەمانە
خۆشبەختی بۆنەو کەسەیە .. لەگەڵ تۆدا ئاوێزانە
ئەی مانگی نور  مانگی نەشئەو ڕەحمی بێ سنوور
خودای غەففار  ئەی خاوەنی گێتی جیهان
ئێمە لەم خاکەی تۆدا
موسافرێکی بێ حاڵین
میوانێکی ئەمەگداری ڕەمەزانین
قبوڵمانە میوانداریت
بمانگێڕە لەسەوزایت
بمانبەخشە لەتاوان
بۆنمان خۆشکە هۆشمان سەوزکە
تەنها دڵمان بۆ تۆ بەندکە
خۆشەویستی (محمد) مان زیاتر بکە
ئەی خودای جوان خودای ڕەحیم وڕەحمان
لێمان وەرگرە ڕۆژومان تێراومانکە
لەکەوسەر شادمانکە بە پێشەوامان

# ﴿چواردەهەمین ڕۆژ﴾

مەبەستمانە خوا لەخۆمان ڕازیکەین
لەمانگی تۆدا لەڕۆژی تۆدا لەشەوی تۆدا ئەی یار
ئەی باگوێم لەدڵی دەف بێ
باچاوم تەهلیلەی ببینێ
پەنجەم شمشاڵێ ڕاژەنێ
کە کوانوی وەفای ئەڵقەی زیکرێك ڕائەژەنێ
دێم ... لەوسەری سۆزێکی دەروێشانەوە
لەوپەڕی ماڵە شێخێك
لەبەردەم داپیرەیەکی ڕەشماڵ لەپشت
لەسێبەری لاوێکی خوێن گەرمەوە هەڵدەقوڵم
تائەوەندەی تر پڕبم لەگۆرانی گۆرانی ئیقاعی صۆفیانە
لەخوێندنی ئاکاری جوان
بۆبینینی مانگی قورئان مانگی گۆڕان
دەسا تۆش ئەی دایە گیان گەر لێرە نیت
فێرتکردین بگرین ڕۆژو
لەبیرت دێ پێت دەوتین تەنها خواپەرستی چاکە
ڕۆڵە کورم موسوڵمانبە خواناسە
هەرئەوە چاکە بۆزینت ..ڕۆژوو توێشوە بۆ دینت

بەخواناسی مەرکانەی خۆشەویستی .. لابدە پەستی وسستی
کزەی گوناھ زەردئەکا قەت لەدنیا بۆدینداری
بۆئاشتی بۆ تەبای فێرت کردین نەکەین سستی
ئەمە وانەی بەرخودانی ڕەمەزانی هەموو ساڵێك بوو
پیرۆز لەتۆ پیرۆز لەمن
خودا بمانگێرە لەوەی کەبۆتۆ بوون
خۆیان خۆشویست لەگەڵ مانگی نووری تۆ بوون
چواردە ڕۆژە لەحزووری تۆدا
چواردە وێنە بۆژیان ئەگرین
لەوپەڕی موحیبەتەوە دێین
بۆنی توحفەی بەرامەی ڕۆژێکی نوێ ئەکەین
تەوێڵمان لەسەر خاکی عەشقە
هێمن هێمن .. بەکوچەکانی ڕێبواریتا ڕێئەکەین
خۆشەویستی ڕێگاتین
بەلآم هەرچ هەنگاو ئەنێین پێت ناگەین
دەنگمان هەردەنگی تۆیە
ڕەنگمان هەر ڕەنگی تۆیە ئەی عاشق
ئێمەی هەستانەوە بەئاورنگی تۆ
ئێمەی سپێدە بەخۆری تۆ
جوانتر لەنهێنی دەگەین

ئێمە هەربەمناڵی لەگەڵتا بووین
بۆیە ڕەنگ ودڵمان هی تۆیە
هەربەمناڵی گەورە بوین ولەگەڵ تۆدا بالآمانکرد
فێری نوێژو ڕۆژوو زیکرت کردین
قورئانت پێ ئاشنا کردین
لەڕەوشتی جوان موتەربەتکردین
هاتوین ئەی چرای داگیرساوی نوور
ئەی زەمزەمی سەرکەمەری ڕێبواری دوور
ئەی پردی پەڕینەوەی بێ سنوور
لەگەڵتاین دێین بۆ نیشتمانی ئەبەد
بۆماڵی نەمری
بۆدیوەخانی جوانی
لەوێ سروودی (الابذکرالله تطمئن القلوب) دەڵێین
ناسك ناسك لەبۆنی تۆدا ڕائەمێنین

# «پانزەهەمین ڕۆژ»

سالآنە مانگ

سنگی خۆی دەکاتەوە و

جمەی دێ لەگوڵزاری تۆوی بڕوا

تۆی ئادەمی خاوەن وەفا

بەرزەتریفەی سەرپشتی ڕەشەبا

پڕی لەهاوڕازو نزا

ئەویندارو بێدار ئازا

لێوان لەبالآ زرافی هەڵۆی شاخا

لەسەوڵ وئارەزووی تەڕی

پڕئیمان وئەمەلی دەریا

هێمن چاپوك وەك نیشتمان ..

بەخێرهاتی لێرەوە ماڵئاوایمان لێدەکەی ئەی ڕەمەزان

تۆشیرینی لەنێو موسوڵمانی کورد زبان ..

شیرین تری لەکوردستان

وەك بەرامەی بۆنت بەرزتری لەڕووی جیهان

تۆی بزەو خەندەی خەباتی ڕێمان

دەبیە شەونم دەبیە نێرگز

وێنەی ئاورنگ دەڕژێیتە سەر ڕوخسارمان

وەك ڕوبار جەستەی ووشك هەلآتومان تەڕئەکەی
کەللەی گەرمی مەیفرۆشێك شەق ئەکەی
چاوی تیژی بۆغەیری خوا بینا کوێر ئەکەی
لەگەڵ هەورا پیاسە ئەکەی
بەخۆرەتاوا هەڵئەچی
گوڵی جوان وبۆنداری ئێمە بەکۆڵ دەدەی ڕاناوەستی
بەئەمانەت ڕێگای ماڵی خودا دەگری
تۆهاتویت وپانزە ڕۆژە لێرەیت  بەتەمای خواحافیزی کەیت
فرمێسکی چاوی مێژوو تەڕئەکەی
بەسەر سیمای ئیمانەوە ئەنیشیتەوە
وێنەی ڕەشماڵ
ڕەشماڵی حاجیلەی جوان  چەشنی وولآت
وولآتی پڕخۆری هەمووان
تۆزی ڕۆژگاری تەڵخ ئەشۆی
بەهەناسەت دەتناسمەوە  هەرچەند خواحافیزی دەکەی
وەلآمی هەموو پرسیارەکان
بەپێ ی ترپەی باران ئەکەی
ئێمە لەحزوورت ئیستێك ئەکەین
پانزە ڕۆژ بە مرحبا و پانزە ڕۆژی
بە الوداع دەست پێ دەکەین

لەگەڵ تۆدا

بەلای لاشەی ئازادبونی خۆرەتاوا ڕێدەکەین

لەسێبەری داربەڕویەکدا دێین ودەچین

لەتۆدا خۆشەویستی دەمانخواتەوە

پارشێو هەرای گوناهمان لێت دوور دەخاتەوە

بەربانگ بەئەویندارى لەسەر سەکۆی ویردزبان

بەرماڵێکمان بۆڕادەخا .. هەموو ئێوارانی دووایی

بەحوزنەوە پەیامی (الوداع) ی لەتابلۆکاندا هەڵواسی

هەموو تابلۆکان وێنەی مانگ نهێنی

لەودیو منەوە ئەیانڕوانی

بەسەر سەرما شۆڕدەبوو

لەپشتمەوە دایئەپۆشی

هەموو تابلۆکانی (الوداع) تابڕبکا نهێنی

لەسیمای سپی دەیڕوانی

بەبێدەنگی هاواری کرد ئەی ئازادی

ئەی بەرهەمی ساڵی وەفای ڕەمەزانی

لە وەداعی تۆ هەموو دلگرانین

الوداع الوداع

مانگی خێرو دوری ونزا

# «شانزەهەمین ڕۆژ»

شانزە ڕۆژە هەوری ئەم مانگە
لەسەرخاکی ئێمە دەبارێت و
یەك یەك ماڵەکان تەڕدەکا
ئەو ئێستا وێنەی خۆر
پرچی بەسەر تەمەنی ئێمەدا دەڕێسا
شانزە ڕۆژە لۆچی دەم وچاوی ئێمە لادەباو
زامی جەستەی گوناهباریمان ساڕێژدەکا
ئەوێستا هەموو شەوێ
زەنگی بێداری لێ دەدا
لەهەموو پارشێوێکدا دێتەوە دنیای دڵمان
تەرمی تاوان ئەسپێرێ بەخاك
نیشتمانی چاوی نابینا
پڕدەکا لەچرای داگیرساو
هەموو ڕۆژێ گەلایەك لەخۆی دەکاتەوە و
دەیپێچێتەوە بۆ ئەودیو
لەو دیو بەئیشارەتێك وەئاگام دێنێت و
دەستەکانم پڕدەکا لە نزای وەفا
چاوم پڕدەبێ لەهیوا

لەژێر سنگی نەسیما
فەرشی ڕزگاربوونم بۆ ڕادەخا
گوڵی ژاکاوی وولاتم بیردەباتەوە
خۆشی دێنێت ناتەبایی دەشواتەوە
کەدێت وخوا حافیزی دەکا
ئاوێك نەزیە بەئێرەدا تێپەڕ دەکا
ئاوی بوئرە یاقوتی ساڵ
دەریایەك خراپە لادەبا
ئاوی نەزیە گوناهم دەشوا
وەك کانیلە لەسەر ڕێکای ساڵ هەڵدەقوڵێ
هێمنتر ناخم دەشڵەقێ
دڵم خۆی تیا دەشۆرێ
ڕەشایی زارەترەك دەبێ
ئەمە مانگە بۆنی ڕەیحانەی لێ دێ
لەهەموو جێیەك دەبارێ
دەچێتەوە بۆ ووجود
لەئاوازی پێشوازی من تێدەفکرێ
بەرەو نیگای جوان دەڕوانێ
ڕۆژی خەمۆکی ئەتۆرێ
وەکو بەهار لەگەڵ سەوزی وولاتا دێ

بەبالأی چنارا هەلئەزنێ

پەرچەمی درێژ هەلئەپاچێ

گۆمی گومان دەشلەقێنێت

بەشوێن پێی کۆترا ئەچێ

لەمیحرابا تەوێلی بەخاکا ئەچێ

ئەمە مانگە سالێ جارێك دێت ودەچێ

خۆی بەهەموو مالێکدا دەکا

لەگەلێ صەلأی بەیانیانا

تاجی شەرەف لەسەر دەکا و

لەگەلێ بەربانگی ئێوارانا

لەگەلێ دەنگی هۆش وبیرا دەبزوێ

لێناگەرێ تا توێشوی قورسی ئەمسالێ نەگاتە جێ

# «حەڤدەهەمین ڕۆژ»

دڵی ڕۆژگاری مانگ حەڤدە ڕۆژە هەرلێدەدا
دەمی خونچەی خواناسینی ڕۆژی بەدر نیشان دەدا
تاڤگەی ئازار وشەختەیە هەوڵ دەدا لەوبەرزەدا
هێزی بڕواو ماڵ بەخشینە خوێنی سورە
یەکەمین بوون نیشان دەکا
ڕێ لە لێزمەی گوناه ئەگرێ دەم بەزیکرە ودڵ بە دوعا
تۆڕی جاڵجاڵۆکەی نیفاق ڕائەماڵێ لەقەدرێکا
حەڤدە ڕۆژە لەئینجانەی دڵی تۆدا گوڵی دانا
دڵ پەیوەستی ئاوازێکە سەرکەوتنی نیشان ئەدا
خودا عاشقی ئەم مانگەم دڵم لەجلیوەی جەماڵتا
بەهارێکم بۆ بسازە کەنیگاربێ لەنیگارتا
من دەبم بەتۆوی کێڵگە مانگی تۆیە لەنێو خاکتا
تۆش ئاودێری تۆوی منبە وەك زەنگیالەم لەبەردەمتا
لەخوانی ڕۆحی مانگی تۆ ئەوە دڵی منە شەیدا
لەعیشقی میهری پاکی تۆ بەردەوام دڵم لێدەدا
دڵم خۆشە بەهاتنت حەزین ئەبێ کاتێ ئەڕوا
دڵ فیراقی مانگی تۆیە کاتێ لەنێومان بارئەکا

زۆردڵخۆشین بەو ساتانەی جوگرافیای گیانمان داگیرکا
ئاسودەین کاتێ ڕێنەکەین بەهەورازی ڕێگەی دوورا
دەنگ و سۆزی لێوی تۆیە شمشاڵی نزا باس ئەکا
ئەوە شیعری مەولەوی یە وەصفی جوانیت شیتەڵ دەکا
ئێستا پەرچەمی مانگی بونم لەم حەقدەیا خۆی نیشان دا
بو بەسەرمەشقی کاروان ومەشخەڵ لەچیا هەڵدەکا
ئەم ڕۆژەبوو کۆڕی یارانی گەرم کرد لەمەیدانی جەنگی بەدرا
دڵ[illegible]وا بوو لەتینوێتی وبرسێتی دا
بەدرو هیجرەت و فەتحێ بوو خودا ناردی بەدوای یەکا
ڕۆژ و نوێژ وزیکرو نزا مژدەی ڕۆژێکی نوێ ئەدا
هەرئەم ڕۆژە بوو بەڵێنی خوا بۆسەرکەوتن جێ بەجێ کرا
پێشەوا بوو هەرخەمی بوو خواپەرستی بێ لەدنیا
ئەرەنوری پەیامی خوایە لەبەدرێکا دەم بەنزا
لەئاسمانەوە بۆزەوی دێ تاریکی ڕۆشن بکا
بەدر وهیجرەت وفەتحێ بوو خودا ناردی بەدوای یەکا
ڕۆژو نوێژ وزیکرو نزا مژدەی ڕۆژێکی نوێ ئەدا

# «هەژدەهەمین رۆژ»

تۆئێستاکە هەموو رۆژێ

زەردەخەنەی رۆژێکی نوێ بەئاشکرا نیشان ئەدەی

بەپەنهانی درکی گوناە ئەبرِیت و

لەجێگەی دا گوڵی جوانی بەرهەم هانی

هەموو ساڵێ بەهێمنی وبێ پەنهانی

ئیستێك لەبەر دەرگای جیهان ئەکەی

دەعوای خۆت پێشکەش ئەکەی

سروودی خۆت هەڵئەچنیت و

لەبەردەم ئێمە ئەباری

لەمێژەوە تۆمیوانی ئێسك سوکی نێومالّمانی

لەدوێنێدا لەنێو بەدری خۆتا پالّکەوتووی

لەئەمرِۆشدا خۆت بۆفەتحی شارێکی دی ئامادە کردوی

وێنەی مەککە شاری دلّمان پاك کەیتەوە

لەرِەشایی وفیراق وزولّم وخودپەرسی

هاتوی بەئەندازەی مانەوەت قوماشی ژیان ئەدووری

ماڵی نەفسی ئومێد بوون بەخۆت ئەگۆری ..

ئەی ماهی سەعادەت

هەنووکە ئەکتەر بۆ شانۆی ژیان دروست دەکەین

گوێ لە ئاوازی ئەستێرەی ئاسمان ئەگری
بەسەرهاتی کوژانەوەی گڵۆپی فیرعەونەکان ئەگێڕیتەوە و
لەغیرەتی موسا تێرمان ئەکەیت و
تۆوی بەردەوامی بۆئێمە دائەکەیت
دیواری مەرگی هەرەس ئەڕوخێنی و
بناغەی ماڵێکی ئەوین بۆسبەی هەڵدەکەنی و
پەنجەرەی ئەو ماڵەش ڕوو لەخۆر ئەکەی
هێمن هێمن
لەشەقامی جەژن و مەولوود وسەرکەوتنا
گڵۆپی سەوز هەڵئەکەیت
ساڵانە مانگێك شیعر ئەهۆنینەوە بۆتۆ
ووشە لەدوای یەك ڕیز ئەکەین
هەژدە ڕۆژە ڕستەیەك لەئێواران وبەیانیاندا دووبارە دەکەینەوە
هەژدە ڕۆژە هاوڕازی کەشکۆڵی تۆین
کەشکۆڵت پڕە لە گوڵی جوان
پڕە لەگەنم پڕە لەنان
پڕە لە هەور پڕە لە باران
تۆ .. ئەی فانۆسی ماڵی ڕۆشنایی
بیرمە هەموو ساڵێك خۆت بەماڵی تاریکی ئێمەدا دەکەیت و
یەك یەك ڕوناکمان دەکەیتەوە

سەر ئەدەی لەمەزرایی کارێزی تینوێتی و

ئەبیتە میوانی ڕەیحانە وبەیبوون

ئەبیتە کۆتری بنمیچی میحرابەکان

ئەبیتە میوانێکی ڕۆح سوك و

ئێمەش بەنیازین ڕەنگ بگرین لەتۆ

هەژدە ڕۆژە لێرەیت و لەکەناری بەختەوەریدا ئەژیت

لەپانتایی زەردەخەنەی لێوی ڕۆژوەوانت وێنە دەگری و

سەبری پروشەی گەلاوەریوەکانی گوناه دەکەیت

کەچۆن لەهاتنی خۆت ڕامان وبەشەرمەوە

یەك یەك بۆ هەتایی دەستیان لەسنگی ئێمە بڕی

بریسکەی تۆ چریکەی تۆ  مێژووی تۆ

لە ئەلف وبێی گۆڕانەوە دەستی پێکردوو یەکەم کەس

نەفسی گرتەوە .. تائێمەشت فێری ژیان کرد

فێرت کردین کەبووین بەباران چۆن ببارێین

کەبوین بەچرا چۆن بسوتێن

کەبووین بەقەڵەم چۆن بنوسین

چۆن لەزوومی ئەقلمانەوە وێنەی ژیان بگرین

# «نۆزدەهەمین ڕۆژ»

نۆزدە ڕۆژە وەك باران تاو تاو
سەری ئەو گوناهانە ئەشۆیت
کەبەنیازی سەرخواردنی مرۆڤ بوون
تۆ ... هەموو ساڵێك بە پەنجە ناسکەکانی میهرتەوە
عومری ئێمە جوان ئەکەیت و
لۆچی ڕوخسارمان ئەسڕیت
تۆ .. هەموو ساڵێك سی جار لەدووکاتی جیاوازدا
دەفتەرەسپی یەکانی ئێمە بەجیلوەی خۆت ڕەشئەکەیتەوە و
سندوقی خێرمان پڕکەیت لەنوور
تا کۆڵی سەفەرمان قورس ئەکەیت
من وتۆ ئەی مانگی عەشق
کەئەمساڵ پێکەوە دەست لەملانبوین و
هاتینە ئەم هەوارە دورێبواری ڕێ بوین
دوو دەستی یەك جەستە و
دوو چاوی یەك سەر بووین
هاتین پێکەوە مەرهەمی زامی تەڕمان کردو و
ئاوی مەرکانەی خۆشەویستیمان دایە نیشتمان و
ئاڵای خەونەکانی داهاتومان

لەسەر لوتکەی شاخ چەقاند
لەگەڵ سێبەرت هەنگاومناو
چاوم بڕیە ئەو شەونمانەی
دەکەونە ڕوخساری پێستە چرچەکانی ژیان
تالەسپێدەیەکی ئەرخەوانی حەقیقەتدا
چڵکی تەمەن لابەرن و
پۆشاکی زیونی عومرێکی نوێ لەبەرکەن
لەپەنا سێبەری تۆدا ڕاچەنیم
فێربووم چۆن پەنجەرەکانی هیوا بژمێرم و
دەرگاکانی زیندان دابخەم
ڕاچەنیم ... لەو ڕۆژگارە شومانەی
کەگلۆپی تەمەنی منیان کوژاندەوە ونەیانهێشت
تروسکاییەك بەدی کەم
تێڕامام لەخۆم ولەپەنا مزگێنی تۆدا
گۆچانی دەلیلی ڕێگام هەڵگرت و
هێور هێور لەدورگەی کەناری بەختەوەری دا ئارامگرت
ئارامگرت ولەپەنا نوری پەیامتا
دەمڕوانییە چاوی ئەستێرەکانی بەختەوەری
دەمدی چۆن بەئاکاری بەرز
ئابلۆقەی ئاسمانیان دەدا و بەدەستەکانیان

هێشووی بەهارێکی جوانیان ئەچنییەوە

خۆشەویستم ئەی مانگ ئەی ساڵ ئەی ڕەمەزان

دەیان ساڵە لەزاکیرەمدا داتای خۆشەویستی

دەکەیت و گوناه سفرئەکەیتەوە

ڤۆلیۆمی محیبەتی خۆت لەهەناومدا بائەدەی و

لەناخمدا هەزارەها زەبزەبەی خێر پەخش ئەکەی

تۆ لەهەمووو ساڵێکدا بەیەك ئیعاز

وەرزی ژیانمان بەهارئەکەیت و

عومری پیری گوناهمان بە پایز ئەکەی

بەرسیلەی خۆشەویستی خۆت

بەباڵای چنارا هەڵئەخەی

وەکو چرا

لەبنمیچ وقوژبنی ژووری ژیانا

ڕۆشنایی خۆت پەخش ئەکەی

پەروانە ئاسا

لەخوانی ڕووحی شەمعێکی نوێ نوچ ئەدەی

بەئاگاییەوە لەپەیڤێکی بەربانگدا زیکری

اللهم لك صمت وبك أمنت وعليك

أفطرت ذهب الظمء وبتلت العروق وثبت الاجر انشاء الله

# «بیستەمین ڕۆژ»

لەگەڵ تەمەنی تۆدا گەورە بووین و
سەرمان لەخاکی پیرۆزی تۆدا نەوی کرد
لەگەڵ تۆدا چەند بچوکی بنوێنین   هێندە گەورە دەبین
بیست ڕۆژ لەتەمەنی خۆمان لەگەڵ تەمەنی تۆدا تەواو کرد و
بیست ڕۆژ گەورە بوین
بیست شەو لەماڵەکەی تۆدا میوانبوین و
شەوچەرەی گەوردبونمان خوارد
بیست شەوە لەڕێورەسمی ناسینەوەتدا
لافیتەی شعوور بەرزدەکەینەوە و
کەڤاڵی جوانی ڕەوشت ئەنەخشێنین
بیست ڕۆژە .. بیست وانەی بەیانی و بیست وانەی شەوان
لەتیانوسی تەراویح وبەربانگ وپارشێودا ئەخوێنین
بیست ڕۆژ لەتەمەنی تۆ  بیست ڕۆژە لەعیشق
بیست بەهار لەعومری ئێمە لەکن مەوکیبی خۆشەویستی دا
وێنەی ڕوبارێك دێت ودەڕوات لەئەلبومێکدا خۆی دەنوێنێت
کەدەریایەك لەدایك ئەبێ
تۆی ئەی مانگ تۆ ئەی ئاو لەسنگی مانگی جوانی ساڵ چەند
جوان هەڵدەقوڵێ و

چەند نەرم دەڕژێیتە نێو ناخی ئێمە
چەند بەئەسپایی ئەمانشۆی و
بەڕشماڵی فراوانی خۆت دامان ئەپۆشی و
بەدەسەسرِی ئەوین فێنکمان ئەکەیتەوە
ئێمە ووشك و تۆ تەڕ ئەی گەواڵە هەوری ئاسمانی ساڵ
دەزانم هەموو ساڵێك لەوەرزێکی جیاوازدا دێیت و
مۆڵەتی ئێمە دەدەیت بەبێدارییەوە
ســی پارشێو وبەربانگ لەگەڵمان نوێژ ئەکەیت و
تارمایی ڕۆحی شەکەتی ئێمە چۆڵ ئەکەی
من دڵنیام لەتۆدا هەموو شتێکی جوان هەیە
پیرۆزی خاك ونیشتمان بەرخودان هەیە
ئاوازی گیان بەخشینی ساڵ
ڕۆحی مقاوەمەت هەیە
لەتۆدا هەموو شتێك هەیە
لەتۆدا دڵنیایی هەیە
لەتۆدا تابلۆڕەشەکانی ژیان دەشێوین و
ڕەنگەکانی ڕووناکی جێگایان دەگرێتەوە
لەتۆدا خەمۆکی بارئەکاو ڕاڕای ئەم گێتی یە جێئەهێڵێ و
ناهێڵێ مرۆڤ ببێتە دەسکەلای ئەم قومارچیانە
لەتۆدا زاکیرەم وەرزێکم پێئەناسێنێ پرِیە لەبەرامەی بەرائەت

میوەیەکم بۆ دێنێت پڕەنەشوناسی خۆشەویستی
مۆمێکم بۆدادەگیرسێنێت نهێنی روناك دەکا
لەتۆدا کانییەك ئەبینم پڕیە لەمرواری
گۆزەیەك ئەبینم پڕیە لەماسی
لەنێوان کانی وگۆزەدا مرواری وماسی دا
مانگێك بەپرووشەی جوانی خۆی خۆدەنوێنێت و
بیست گوڵی جوان لەحەوشەی ئێمەدا ئەچێنێت
تائێمەش دەرگای دڵی بۆ بکەینەوە و
بەشوێن پێی ڕێبواریی مانگدا ڕۆحمان ئاوەدانکەین و
بۆتەمەنێکی هەتایی
لەکۆشی کانی وگۆزەدا
ئاوی حەیات بخۆین
بیست ڕۆژە بەڕێوەین و ماندوو نابین
بیست ڕۆژە ڕێئەکەین وعارەق ناسڕین
بیست شەوە لەگوانووی وەفادا وەنەوز ئەدەین وناخەوین
ڕێئەکەین وناسرەوین
بیست شەوە ئاسودە ئەژین

# «بیست ویەکەمین ڕۆژ»

مانگ

هەموو شەو وڕۆژەکانی لەمیهردا ئاوێزان کردووە

دەیەوێ گرەوی ژیان بباتەوە و

لەتەنیشت دەم وچاوی نگینی ساڵدا

تەراویح وبەربانگی خۆی نیشاندا

بیست و یەك ڕۆژە بەتەمای بوراقی قەدرین

شەوی سابات ..بەبێ ووچان

لەپەنا ڕوخساری ڕوناکی ژیان

لەشەمعی کۆکەرەوەی قورئان

پەیامبەرە دێنێت خەڵات

نیشتمانێك سەوزتر دەکات

خاکێك پڕدەکات نەجات

بەخێرهاتی ئەی بوئرەی تەوێڵی مانگ

کەڤاڵی جوانی ساڵ

شەوی قەدر قەدری مانگە بەنووری قورئان

بمانژێنە لەبانێژەی میحرابەکان

تۆ ئەو مامۆستا پڕنورەی

هەموو شەوێ وانەی عیشقی ڕۆشنایی ئەڵێیتەوە

ئەو مرواریيە چاو خەنەییەیت
خۆت دەكەیتە دەواری سكونەتی شوێنكەوتوان
ئەو ئاواز وهۆنراوەی
بەسەرو بەندی ڕۆژژمێری ساڵدا ئەباری ..
وەك باران ئەژێی وەك گوڵدان
ئەژیتەوە وەك پەرچەمی وەحدەت وئیمان
هۆئەی نوورستانی شەوی یەڵدا
چرای چاو گۆچانی دەستی پیری با
نیشتمانی سەوزی چرا
قەدری مانگی دڵ تامەزرۆی بێ نەوا
بەپرشنگی پیرۆزی خۆت پیرۆزمانكە
ئەی پەپولەی سپی جۆ ئاوی رۆژی گەرما
تەمەنی ژینی پاكی هەوا
شەوی پیرۆز  شەوی قەدر بمانكە هۆز
پێمان ببەخشە هێز  زۆر بەپێز
بۆ ڕووبەڕوبونەوەی تێز
ئەوتێزانەی چاویان لەچاوی تۆنایە
دڵیان نەگریس جەهلیان تیایە
تێزی سەر بۆز لەڕووی نایە كەتۆ هاتی
بێتە دەرگایە

ئەی شەوی جوان  شەوی پاکیزەی دلآن

شەوی خەلْوەت  شەوی جیلوەت

سکونەت بۆخوای میهرەبان

بەکڕنوش وسوژدەبردن شەوی قەدر پیرۆزمان دەکات

بۆنی صلاة التسبیح وحەلْقەی زیکر و

خوێندنەوەی جوزئی بیست ویەك و

هەموو تەمەنی شەوی نوور

شایەتی تۆن ئەی مەوکیبی بێ سنوور

شەوی قەدر نزیك و دوور

بمانژێنە بەخۆش مروور دێتەوە ناومان زۆر سرور

ئەی ئاسودەیی دلّەی شەیدا

ئەی عەیش وخۆشنودی صەفا

پڕمانکە لەئەوینی خۆت

ئەی ڕوناکی نەخشی نیگا

پێمان عەطاکە لەنەزیهی شەوی قەدرت

ئەی مانگی سالّی زیبا

زیبای قەدری بێ نەوا

# «بیست و دووهەمین ڕۆژ»

قەدر لەنورستانی مانگ خۆی نمایش دەکاو
لەپەنای هەر ڕۆژێکدا
هێمای ڕاست لەسەر تەوێلمان دەدا
قەدر سایەی نگینی هەڵبەستی مانگە
میمبەری گەورەی تەراویح و نوێژی وتر و
چەهچەهەی سەری نەباتە
قەدر لەپەنا نوری خوادا
تاریکی دەپێچێتەوە و
لەشەو نوێژێکدا جلیوە دەکا
بەردەوام چاودێری دەکا
لەناخاندا دەژی .. بەردەوام وەك دڵمان لێدەدا
چی نهێنی ئەم گەردوونە ئاشکرای دەکا
شەوی قەدر هەموو شتێکمان پیرۆز دەکا
بێدەنگی وەلا ئەخا
باڵی ڕەش وجلی ڕەش و
شەوی ڕەش و شاری ڕەش و
سەرکردەی ڕەش خەفەتەکا
شەوی قەدر مانایەکی نوێ پەخش ئەکا

هەرچی گۆزەی سەر ڕێ هەیە

ڕێگای بەجێ پیری دەکا

هەرچی شوشەی شەربە هەیە

شەربەی بێ جێ خاڵی دەکا

ئەمە شەوە پڕ لەنوورە تاریکایی ڕووناك دەکا

قەڵەم هەسانی شیعر دەکا

تەوێڵی سپی لەم شەوەدا

هەزارەها کرنوش دەبا

بەرماڵی کۆڵی خوشکانمان

هەرجارەو لەهەر جێگەیەك

بۆپیرۆزی ئەم تەدارەکە

بەخواستی خۆی نوێژی لەسەری ڕادەخا

ئەمە شەوە لەهەموو وڵاتێ

مانگ ڕۆشنایی خۆی پەخش ئەکا

کوڕم دەوێ بێ ئولفەت بێ

حەزنەکا بەرعەفواتی با

ئەمە قەدرە لەگشت جێ یە

بێ پەساپۆرت تەنها یەك ناسنامەی پێ یە

سەربەرزی یە بۆئەو کەسەی

کەهەمی ئیسلامی پێ یە

ئەمە قەدرە تیژ پەل دەدا
بەو ناسنامەی هێمام دایە
لەهەرکوچەو قوژبنێك وبێ شەلاّنێ
یاخود لەهەر ناوچەیەك و
ولاّتێکی خاوەن پەرچەم وبێ پەرچەم
وێنەی کوردمان بێ ئالاّیە
ئەم هەر قەدر زیاتر دەبێ مێژوو دیارە
چۆن بەرگری لە قەدر ومانگ وساڵ دەکا
بەردەوام خۆی مانیفێست دەکا
دێت ودەچێت ڕاناوەستێ
لەبەرئیشتیاقی خوا
بۆدیداری چاوەڕوانە
قەدری پیرۆز پیرۆزی کا
ساخودایە لەم شەوەدا پیرۆزمانکە
قەدر بەنصیبمانکە لەئەم دنیا و
لەو دنیاشدا
ئەی خودایە ڕزگارمانکە
قەدرتەقدیری گیانمان کە
گیانمان بەخۆتناسی شادکە

# ﴿بیست وسێ هەمین ڕۆژ﴾

بیست وسێ شەو رۆژە

بەهاری ڕەحمەتمان بارانمان بۆدەبارێنێ وتێرناخۆین

بیست وسێ شەوە بۆنی گوڵ ئەکەین وبەبۆن ناکەوین

چونکە بۆنمان تەنها بۆنی ئەو ئەگرێ

ڕەنگمان تەنها ڕەنگی ئەو ئەگرێ

جەستەمان لەو ئەچێ

چاومان تەلیسمی عەشق ئەیگرێ

دەستمان گۆچانی ئەو هەڵئەگرێ

سەرمان تەنها لەخاکی ئەوا دائەنرێ

زمانمان بەناوی ئەو بەرئەبێ

ترپەی دڵمان لەهەرشەو وڕۆژێکدا

بەکاتی ئاسایی خۆی هەربۆ ڕەمەزان لێ ئەدرێ

تەنها خوێنی قەدر ئەگرێ

لەگەڵ نێرگزدا ئەژێ

بەمرەکەبی سەوزی دیوانێ ئەنوسێ

ئەمە قەدرە بەلوگفی خۆی بۆئێرە دێ

خاکی دێمی ووشکە ساڵە ئاو ئەدێرێ

داری ئومێدی ساڵمان بەنەسیمی قەدر ئەشنێ

ئەمە قەدرە وازناهێنێ
بەنووری خوا تاریکی ئەبڕێ
بەعیشوەی نازی بانگخوازان
ئاوازی خۆش سروودی بێدار بۆگرۆهی بەشەر ئەچڕێ
مانگ بیست وسێ شەوە دێت ودەچێ
مژدەی نووری خودا دێنێ
شەوی قەدر پیرۆز ئەکا
سورەتی خۆی دائەبەزێنێ
وێنەی تیشکی خۆر دێت و دەچێ
پرشنگی خۆی پەخش دەکا
لەگەڵ دۆستانیدا ئەژێ
دڵی خۆی بۆیان دەکاتەوە
دەشتی جوانیان سەوزتر دەبێ
ئەمە مانگی میهرو قەدرە
ڕێگای عاشقای ژیانمانە
کاروانی ڕێی بێدارمانە
مۆمی ڕێگای ڕۆشنمانە
گوڵی ئینجانەی ساڵمانە
چەتری سەری هەتاومانە
خەڵوەی عەشقی ئیلاهیمانە

سۆزی دەفی دەروێشانە

تەهلیلەی زیکرێکی وونی بۆخواسوڵتاوی ژیانمانە

ئەمە قەدری قەدەرمانە

قەدەری قەدری دڵمانە

دڵی شەیدایساڵمانە

ساڵی مانگی ڕەمەزانمانە

ڕەمەزان ڕەمزی بوونمانە

بونمان بۆخودا ژیانمانە

ئەمە قەدەری ساڵمانە تەدارەکی ڕۆژوومانە

ئاپۆڕای زیکر و وویردمانە

سەهەندی نوێژی شەومانە

ئەمە قەدری قەدەرمانە

مانگی ئارامی گیانمانە

بارانی سەر کێڵگەمانە

مانگی ڕەحمەت و مەغفیرەت ورزگاربوون لە ئاگرمانە

# ﴿بیست وچوارەمین رۆژ﴾

شَهْرُ رَمَضَانَ الَّذِي أُنزِلَ فِيهِ الْقُرْآنُ هُدًى لِلنَّاسِ
وَبَيِّنَاتٍ مِنْ الْهُدَى وَالْفُرْقَانِ

لەکن مەوکیبی ئەم ئایەتەوە ڕێدەکەم
لەگەڵ ئەم سەهەندەدا دەمەوێ بڕۆم
لەئاوەدانیا فێری خۆشەویستی بووم
دەبێت موحیبەتی موحەمەدم خۆش بوێت
لەئاسمان لەسەر خاك
بەنووری یەقینی خواوە
لەئامێزی ساڵدا مەچەکی مانگم نیشاندراو
لەبالأی ڕۆژووم نا
ئێستا بیست وچوار ڕۆژی پڕ لە ڕاز
چل وهەشت کاتی جیاواز
لەتەراویح وبەربانگ
نیگای بەرداوەتە دەشتی پایتەختی ساڵ
جوانتر لەجاران ئەبینێ
بەئومێد عەشق ئەدوێنێ
لەژێر کەزییەی زەردەی خۆرا

ڕوناكی بۆ هۆز دێنێ
دەست دەخاتە نێو دەستی شوان
تەنووری زیكر گەرمئەگا و
سەرتاپا جەستەی پڕهیوا
ئەچرپێنێ بەگوێ ی منا
هەرجارەو لەهەر وەرزێكدا
جارێك لەسنگی هاویندا
جارێكی دی لەپایزی هەڵوەرینی گوناها
قەهرێكی تر لەبەركوانووی وەفادا
بەویقار خۆی دەنوێنێت
میسك ئەبارێت
سنەوبەری عیشوەی نازی خاك ئەكێڵێت
دەهرێكە لەبۆنت تێر ناخۆین
ساڵێكە بۆ پێشوازیت ئامادەین
خۆشمان ئەوێی ڕەمەزان
وێنەی ماسی دەریاو ڕووبار
بەژنی كۆتری دار تێلەكان
شاهی شەمعی میحرابەكان
ڕوومان لەمیحرابی تۆیە  ئەی ڕەمەزان
لێوان لێومان بكە لەخوان

خوانی قورسی توێشووی کاروان

کاروانی ڕێی بێداران

بێداری بەدری ڕۆژوەوان

ڕۆژوو بۆ سڕینەوەی تاوان

تەراویح پۆشاکی ژیانمان

بەربانگ لەماڵی ئیمان

بۆخانەی سەوزی ڕەمەزان

هەڵکەین چرای ڕێگای ژیان

بەدڵ وبەگیان

بەویردی اللهم أنك عفو كريم تحب العفو فعفو عنا .

لەماڵی تۆدا بژین بەئەمان

ئەی بەرامەی شیرینی شەنگی ئاسمان

سومبولی شارەنگی مانگان

بخوردی بەرزی نیشتمان

تۆی سکونەتی بۆهەمووان

ئەی قەدری بەرامەی ساڵ

سەهەندی زیکری بەرخودان

پیرۆزمانکە لەدوو جیهان

# «بیست و پێنجەمین ڕۆژ»

لەنێو ژورەکەمدا وبەتەنیشت فانۆسێکەوە
دەستم دەنێمە نێو دەستی شەوێك
کەپڕیەتی لەتەهلیلەی خۆشەویستی
لێوان لێوە لەشیعری عەمبەر خاتوون بۆ مەولەوی
پڕیە لەغوربەتی نالی
صاف وبێگەرد وەکو قەصیدەی مەولەوی ...
ئەی قەدری دوورگەی دووری نەجاتبوونی ئادەمی
دەزانم تۆش بۆخەمی من هاتویت و
بۆنی عیشقی بەهاری تەمەن ئەگری
بەدەم سەحەری درەنگێکی شەوالەوە
زالگەی سەروەری بۆ ئێمە دادەنێیت و دەستمان ئەگری
دەستمان ئەگری وبەناو گوڵە شەونم ونێرگز وگێلاسدا
ئاوێزان لەخۆتمان ئەکەی و
دەرژێتە نێوگوڵدانی عەیشێکی نوێ و
تەمەنی ئینجانەیەکی سەوز وەك سنەوبەر
بەرگەی سەرماو گەرما ئەگری
ئەی فانۆسە پڕتیشکەکەی شەوانی تار
لەگەڵت دێم بەناخی شەقامەکانی شاردا

شۆڕدەبمەوەو دەستم دەخەمە سەر یەك بەیەكی
درەختەپاكیزەكانی جوانی
تالەسەهەندی دوانهێنی ئەم قەدرەت دەگەم
پیاسەی ڕۆحی بیست وپێنج شەو دەكەم
بەئاوی نەزیهی تۆخۆم دەشۆم
دێم وهەنگار لەدوای هەنگاو
بەرەو جێژوانی تۆ
لەوێستگەی نازڵبونی پەیامی تۆ
لەشەوی قەدری بیست وحەوتی تۆ و
تابەیانی ئێشك دەگرم و
نهێنی چركەساتەكانی قەدربوونت ئەژمێرم
ئابەم فانۆسەوە هەرلەو شەوەدا
چی ڕەشایی ونامۆبوون و
دڕك ودالْ وسەبەل بوونی ژیان هەیە
بە گڕی تۆ ئەسوتێنم
پەنجەی دەستم دەخەمە سەر دێڕ بەدێڕی پەیامەكەت
تاهەنسكێك وەك گریانێكی منالْ
بۆتێربوونی شیری دایكێك دەنالێت
وێنەی ئەو ... خۆم ئەخزێنمە نێو
ئارامگەی خۆشەویستی تۆ

تابەرلەوەی جێمان بهێڵێ

بەرلەوەی ساڵی غەریبی پۆشاکی خۆی دارنێ

زەردەخەنەی نەجاتبوونمان پێ ببەخشی

هاتووم ئەی قەدری دەروونی مانگ

لەپەنا ڕوناکی تۆدا

لەپەنا ڕوخساری تۆدا

لە تەنیشت مەغریبی نزاو

بەربانگ وتەراویحتدا

وێنەی خەزانی پایزێك

مەرگی گوناهم هەڵدەوەرێنیت و

گوڵدانی شیعرم پڕکەیت لەصەفا

تاله مەودای ئەمساڵ و

گەشتنەوە بەلیقا

هەموو جارێك لەبەربانگێکدا بڵێن

اللهم أغفر ذنوبنا وكفرعنا سيئاتنا وتوفنا مع الابرار

# ﴿بیست و شەشەمین ڕۆژ﴾

بیست وشەش ڕۆژە
لەم شۆڕشی گۆڕانەدا چرای ئاوی دیوانێ تەی ئەکەم
کەخۆی هەڵواسیوە بە منارەدا و
زەیتونی شیعری سی ئێوارە و
سنەوبەری چیرۆکی سی پارشێوی لەخۆگرتووە و
بەنیازە لەسەکۆی نمایشنامەی بەختەوەریدا
ڕوو لەئیلاھ کەڤاڵی چرا ڕەنگاڵەکانی خۆی
لەگەڵ ئاورنگی زیکری شەوێکی تولانیدا
لەگەڵ حەڤدەجار تەوێڵ بەزدوی دا
ئاوێزانی خوانێك ببن
کەبەوێنەی بەفر ئازا و
بەوێنەی ئەشکەوت نورین و
بەوێنەی داربەڕوو بەئیستیقامە
بەوێنەی ئاو پاك
بۆ پێشوازی ژوانێکی نازڵ بووی پەیام
بیست وشەش ڕۆژە هاتووم
لەگەڵ یەکەم خولگەی مانگتا
خول بەدەوری باڵی زیوین و

سێبەری کەسکدا دەخۆم
بیست وشەش ڕۆژە لەم بورجەدا
خەم هەڵئەڕێژم و
مەرهەمی زامی ڕابووردوو ئەکەم
لەپەنای ڕووباری غوفرانتا
کۆچ بە ووشەی ڕەش ئەکەم
لەگەڵ یەکەم سەوڵی لێداندا
خۆم دەگەیەنمە سەرکەشتی ڕزگاربوون و
سەوڵ لە ڕاڕایی دەدەم
لەپەنا ئەیلولی ئەمساڵدا
بۆدیداری قەدرێکی نوێ
لەبەرپێتا هەڵئەزنێم و
شیعرێکی ڕیش چەرمووی مەولەوی
دەکەمە دەسپێکی ئەم ژوانەم
تالەدەفتەری ئەعمالا
شاهیدی ئەم هاوسۆزییەم بۆ بدا
بیست وشەش ڕۆژە هاتووم وبەنیازم
لەسەر سەکۆی حوجرەکەی نالیدا
بیست وحەوتەمین تێکستی ئەم قەصیدەیەم بنووسم
بەتەمام هەناسەی ئازادی مرۆڤ

لەئاسماندا نیشانبەم
هاتووم لەماڵە خنجیلانەکەی ساڵدا
ســی ڕۆژ ووشەی ئاڵتونی بچنم و
سی شەو پێخەفی بەرماڵی نەزاکەت بەخۆمدا دەم
هاتووم لەبەرپێی ئابەوە
خەزانی گوناه کەم لەئەیلولی مانگەوە
کەرنەڤاڵی جەژنی تیا تاودەم
ئەیلولی شیعر شیعری ژوانی ئیمانداران
ئەیلولی عیشق  لێوی تینوو دڵی بەئاگای قورئان
ئەیلولی ئەمساڵی جێژووان
مانگەشەوی نەرمی تریفە و
دەنگی ئاوریشمی نزا و ئاورنگی سحوری بەرەکەت و
پیاسەی بێ ترسی سەرما
بیست وشەش ڕۆژە هاتووم و
چاوەڕێی ڕۆژی دواتر ئەکەم
کەقەدر لەقەدما سەوز بێو
خوناری دڵم بکێڵێ
بیست وشەش ڕۆژە
هاتوم ولەگەڵتا هەنگاو هەڵگرم
تالە ڕۆژێکی نوێدا
تێکەڵ بەژوانێك ببم تالەنێو ئەم ژوانەدا
قەرزی ئەو هەموو نوێژە بگێڕمەوە

جوابی ئەو هەموو بانگانە بدەمەوە و
جارێکی دی خوانی
ساڵێکی دی ڕاخەم بۆ پارشێو
خوایە گیان بیست وشەش ڕۆژە
چنگی زەعیفی خۆم
لەبەرماڵی فراوانتا هەڵئەدەم
تافێری وەفادارییی بم
زمانی قسەم زیکری ڕولەتۆ ئەکەم
تادڵی ئەو فریشتانە خۆشکەم
کەرەقیبن بەسەرمەوە و
خۆت ناردووتن
خوایەگیان پێم عەطاکە
بەرەکەتی شەوی قورئان
ئیدی لێرەوە دەچینە
خەڵوەتی شەوی قەدرمان
خوایە پیرۆزی کە مانگمان
بمانخە ژێر سێبەری ئەمشەوەمان
شەوی نازڵبونی قورئان

# «بیست وحەوتەمین ڕۆژ»

خوانی ڕۆح بەکۆڵی مانگەوە هەنگاو هەڵدەگرێ و
ئەیەوێ وەك هەورێکی پڕباران
وەك ئاوازێکی خۆشی ساڵ
بەوێنەی بۆنی نێرگزی بەهار
لەمەجلیسێکدا بباری
کەپڕیە لەگمەی زیکری بەیانی و
فرمێسکی پەشیمانی شەوی نزا
قەدر .. باوەشی قەدری خۆی
بۆجەستەی ئێمە کردوەتەوە و
سرودی پەیامێکی ئەبەدی ئەچرێ
ئەو ئەودندەی ئێمەی خۆشئەوێ
فرمێسکی سەر ڕوخسارمان ئەسڕێ
بەهێواشی و بێ دەنگی شەوێکی نوور دوور لەنامۆ
لەسەر باڵی ڕۆژی جەژن
سپی سپی هەڵئەکورمێ
لەڕۆحا ئاوێزان بەخوێن و
لەسیمایا ئەسەری سجود دەرئەکەوێ
ئەو وەك درەختێکی بەرهەم پێ ئەکەنێ
ماڵ بەماڵ وژوور بەژوور و
کۆڕ بەکۆڕ مزگەوت بەمزگەوت ئەگەڕێ

دەچێتە هزری کەشی حاجییەك چاو ئەگێڕێ
لەبەرامبەر تەوێڵی دایکێکی سەرسپی ڕائەموسێ
بەبالأی گەنجێکی ئولفەت بەمنارەوە هەڵئەزنێ
ئەگەڕێ وئەبینێ تامی میوەی ئەم درەختەی
لەسەر زمانی خۆشەویستی ئەم مانگەدا
چەند چێژی خۆشبەختی وەرئەگرێ
قەدر بەئەسپایی و هێدی لەساڵێکدا
یەك جار ژووان ئەگرێ
بەسادەیی و زۆر بەقورسی
لەسەر شاخی ئیماندا وێنەی گوڵە کیویلە
خۆی لەبەرۆکمان ئەدا ئەو بەعەشقەوە ئەگەڕێ
لەو میحرابەی مەدینە خۆی نیشان ئەدا و
لەئەشکەوتی نوور نورێکی تر لەخۆ ئەگرێ
شەوی قەدر
شەوی جاویدی بۆن وبەرامەی عەتر
پەیڤی شیرینی میحراب و
خەیری قوڵی هەزار شەهر
شەوی ڕووباری ماندووی ساڵ
ئەی خنکێنێ شەپۆلی هار
سروودی شەوی ئازادی
شەقژنی دووباڵی ئاسمان
قەدر شەوی ڕوونـــاکی ســـاڵ

# «بیست و هەشتەمین شەو»

بیست وهەشت شەوە مانگ
ماچی پەنام دەداتێ وتێرم ئەکا لەنان
خەندەو شەونخونی پاکیزەیم پێدەبەخشێ
هێندە گەورە وسەربڵندە
لەپەنا سێبەرەکەیەوە سکونەت
دەکاتەوە بەباڵای ڕۆژدا
بیست وهەشت ڕۆژە
خۆری نورینی ساڵ لەژورەکەمدەدا و
چی بەکتریا ومیکرۆبی دارزانی ڕۆحم هەیە دەیکوژێ
دەزانم بیست وهەشت ئێوارەو بەیانی یە فێرمەکەی
بەفرم خۆشبوێ وهۆنراوەی دڵێکی سپی
بئاخنمە نێو لاپەڕەکانی مێژوو
فێرمەکەی چۆن چاوەکانم داگیرسێنم
لەم جەنگەڵستانی ڕۆژەدا
کەهەموو هۆکارێك ئامادەکراو
بەکوژانەوەی ڕۆژ
فێرمەکەی چۆن دەستەکانم ڕوو لەپەروەردگار
بەرزکەمەوە وشەپۆلی دووعا بۆنغرۆبونی

ئۆقیانوسێ گوناهکەم
فێرتکردم چۆن بەزمان ودڵ
بەدووباڵی لێوی ئاڵتون
تۆزێ کوفر وگەردی گوناه
لەسەرسنگی ئەم ماتافەت ڕابماڵم
لەدەرا وەزەی بەختەوەری
ئاڵای سپی بەتەوێڵ دادەم
هاتووم لەباوەشی پارشێوتدا
هۆرەی عیشقی
ڕازو نیازی میوانداری تۆ هەلگرم
تالەمیحرابی نوێژێکدا قنوتێکی نوێ هەڵڕێژم
هاتووم لەبەربانگی خەندەی مانگدا
نەخشەی دیواری ئاوەدانی دڵ داڕێژم
تاماڵ پڕکەم لەبخور و
کەزیەی شۆڕەبی داهێنم
هاتوم فێرمکەی چۆن چۆنی
سواغی جەستەم بە زیکرکەم
هەناوی ڕۆحی ڕاکردووم
بەشەو نوێژێ موتەربەکەم
کۆڕی عەشقی ئەم جێژوانەم

لەپەنا داری جەژندا
پڕ لەچڵ وگەڵا وگوڵ کەم
هاتووم لەنێو جوانی تۆدا مەلەبکەم
لەکانیاوی غوفرانتا
جەستەی گەرد لێنیشتوی خۆم
بەتنۆکە ئاوی نەزیهـ وورد وورد بشۆم
ئاخی عومری مێژویەکی ئازادی بوون
دوای پەیوەست بوون بەزیکرو ویرد
بەنوێژ و قنوتی سرود
بکەمە چەپکێ هۆنراوە و
لەچێ ژوانی ئەم جەژنەدا یەك یەك داتنێم
هۆئەی مانگە ڕوخسار جوانەکەی تەوێڵی ساڵ
ئەی خەرمانە بەرەکەتدارەکەی پەروەردگار
خۆشم ئەوێی هێندەی
پیرێ بۆگۆچانەکەی ڕێگای پیری
ئاوێزانی خۆمتدەکەم ئەی بالأزرافی ئەوینی
تادیداری ساڵێکی دی خوات لەگەڵ
ئەی مەرکانەی خۆشەویستی پەروانەی شەم

# ﴿بیست ونۆهەمین ڕۆژ﴾

بیست ونۆ ڕۆژە لەباغی دڵتا ڕواوم و

نزای گوڵە مێخەکێك لەسەر سنگی تۆدەکەم

تائاسودەیی لەگیرفانی لەیلەتولقەدرا

سلاَوی بەخشینی گوناهم لێی بکا و

سینەی هەتاوم لەئیمان پڕکا

بیست ونۆڕۆژە بە بەرماڵی خۆشەویستی یەوە

بە بەرامەی مانگەوە

بەتەوێڵی نورینەوە

شەڕ لەگەڵ ئارەزووەکانی خۆمادەکەم و

یەك یەك ئەندامەکانی لەشە لەسەر

بێدەنگی ڕاهێناوەو دڵیشم سپی کردوەتەوە

بۆ گەشتن بەرەو لوتکە

بیست ونۆ ڕۆژە وەك سنگی خۆر وەك پەلی مانگ

ڕوناکی تۆ لەخۆم ئەدەم

تانوری پاکێتی ئەم شێتی سەرکەشی یە ڕامالێت و

لەحزەیەك ئاسودەیی بگەڕێنێتەوە بۆ بالاَی نیشتمان و

تاوانەکان بکاتە قەرەبروت و

ئارەزووە شەیتانییەکانیش بکاسوتماك.

بیست ونۆ ڕۆژە لەسەر یاسای ئاسمان
خۆم خستۆتە بەر ڕێژنە بارانی جوانیت و
دەمەوێت جەستە وگیانم بخوسێنم لێت
بۆماڵی هەتایی خۆت
تابەم ئیمانهێنانە بەردەوامییەمەوە
بگەڕێمەوە بۆ ووجوود
بیست ونۆ ڕۆژەهێزی نوێبونەوەم
لەبەر میحرابیماڵەکەتدا
وەك شۆڕەبی ناو ئاو ئەلەرزێ و
چی بروسکەو ناڵەی سەرکەوتنی هەیە
دەیکاتە مەقامی ملکەچ بوون
تابەم پۆستەیەوە لەبەردەم خودا گەورەبێ و
بستێ خاکی نەمری بۆهەواری
ژیانێکی نوێ بەخۆیدا داو
لەهەموو ئافاتێکی ئەم دنیا دەربازی بێ
بیست ونۆ ڕۆژە لەماڵی ئاوەدانی تۆدا
بەپێخەفی شەو نوێژێك خۆم ئەشارمەوە
لەو گوناهانەی کە ڕۆژ یەخەم پێ دەگرێ
لەماڵەکەی تۆدا بەم کۆتاخولی مانگەوە
لەم ئەرزە پیس کراوەدا

تەنیا تۆ شك ئەبەم خودا
ڕوخسارم بەئاورنگی مانگی خۆت تەڕکەو
تەوێلم بەخۆری نورینت ڕوشتکەرەوە
بیست ونۆ ڕۆژە لەسەرخۆ ڕۆژی دووجار
بەئارامی ناولەپم ڕوو لەئاستانەی
تۆدەگاو دەیەوێ دەستی خۆت بەسەرمدا بهێنی پەروەردگار
تادەرگای چونەژوورەوەی بەهەشتم لێبکەیتەوە و
ئاشنامکەی بەجەننەتەکانی جوانی
بیست ونۆ ڕۆژە هەموو کوچەو کۆلانێکم لێبوەتە
باخچەی مزگەوت و
هەموو باخێکم لێبوەتە سینی بەخشینەوەی خێر
هەموو ئێوارەبەیانێکی ئەم بیست ونۆڕۆژە
دەستەکانم پڕدەکەم لەنزاو ڕوەوئاسمان بەریانئەدەمەوە
بەوئومێدەی لەئاسمانا تنۆك تنۆك
ئاوی لێبوردەیی برژێتە سەر لاشەی ووشکم و
هەناوی بیابانم بۆ هەتا هەتایی تەڕکا
بەکۆترێك ئەم وویردو تەراویح وڕۆژوە
بداتەدەست هەناسەی سەوزی ئەم نوێبونەوەیەو
لەقیامەتدا پشویەك با

# ﴿سی هەمین ڕۆژ﴾

مانگ کۆتا هەوری بەڕەحمەتەوە باران و
ئەم متبونی زەوی یەی دایە دەس خورماو نێرگز
ئەی زەوی کۆتا هەور چامەی ڕەحمەتێکە بەسەرتەوە
خوڕەمدەگاو بەخۆشەویستی یەوە دەتداتە دەسی
پاساریەکانی میحراب و یەك یەك
لەحەوزی مزگەوتێك ووسڵی پاکبونەوەت لەزەنگی گوناه دەردەکا
خودایە .. سی ڕۆژە ئەم دڵەی من شەلاڵی خوێنی مانگ بوەو
توند چەقبوەتە سەردڵی ئەرز
هەموو گۆرانی و هۆرەیەکی لەسیناریۆیەکدا داڕشتووە کە ڕۆژووە
هەموو ئیقاعێکی تابلۆیەکی ڕەنگ کردووە کە پارشێوە
هەموو تیانووسێکی بە قەڵەمێك رەش کردووە کە تەراویحە
هەموو زەمزەمی وتفەنگێکی لەشاخێکدا هەڵواسیوە کە بەربانگە
خودایە... ئەم کۆتا بەربانگەی من بکە...
بەخشتی خەزێنەی خێرم تالەخەرجی
دروستکردنی ماڵێکدا بکەمە یەکەمین مەصرەفی ژیان
بۆئەوەی فێربم ولەزاکیرەمدا بچەسپێ
خۆشەویستی مانگی قورئان
خەلاتی خوایی پەروەردگار

خودایە سی ڕۆژە سوراحییەکانی گەورەبونمان ملکەچن و
پەرداخەکانی خۆشەویستیمان پڕن لەهەناسەی سەوز
سی ڕۆژە جوتیارەکانمان ئاوی باخەکانیان
ئەدێرن وبەپەلوپۆی ئیمانەوە پەرژین دروستئەکەن
سی ڕۆژە قەڵەمەکەم پڕبووە بەووشەی مانگ و
تیانوسەکەم بۆنی بەرامەی ڕۆژێك دەکا
کەپڕیە لەپێکەنینی زەوی و خەندەی ئاسمان
سی ڕۆژەماڵەکەم
نیشتمانەکەم
کۆڵانەکەم
پەرچەمەکەم
سیواك و
ڕیش ولەچکەکەم
ئاسۆی خۆرو لوتکەی شاخ و
بەلەپیتکەی تفەنگەکەم
سی ڕۆژە هەموو هەوڵەکەم
لوتکەی ئومێدی مانگەکەم، بەئاوی نەزیهـ
لەدەڤەری لێخۆشبونی خودا دەشۆم
سی ڕۆژە شیعرم نان هەڵئەگرێ
وویردم نارنجۆکی کەمین ئەتەقێنێ و

لەهەموو ڕێیەکی تەنگەبەردا شەیتان ئەکوژێ ...!!
خودایە لەوەتەی مانگ هەیە ... مرۆڤ هەیە
بەهەمان شێوەش شیعر هەیە
لەوەتەی هەم خۆت دەسپینی ئەوینت هێناوە بەسەرماو
سوپاستکەم
سەرم بودتە صندوقی دۆزینەوەی تۆ
زمانم بودتە تەنافی درێژترین قەصیدەی تۆ
دڵم بوەتە کێڵگەی تۆوی بڕوای عەشقی تۆ
جەستەم موچرکێ دایئەگرێ بەناوهێنانی ناوی تۆ
خودایە قەڵەمم تیژکە بۆدوژمنانی دینی تۆ
شیعرم بەئاوازێك خۆشکە کەجوان ببێ بەجوانی تۆ
تادیوانی شیعری عەشقم پڕبێ بەناو وزیکری تۆ
خودا بمگێڕە لەوکەسانەی
ووتارئەدەن
شیعر ئەنوسن
زەمزەمی مەخزەن ئەبەسن ، ڕۆژوی مانگی تۆئەگرن ،زەکات
ئەدەن ،دەست نوێژئەگرن
ئێشك گر و بۆ بەرزبونەوەی ناوی تۆ
خودا بمکە بە ڕەفیقی یارانی خۆشەویستی خۆ
بمکە بەنەمامی ئەوکێڵگەی ئاوەدانیەکا ناوی تۆ

خودایە سی ڕۆژە بە نێوژان وخوێن وکۆچ وگڕەوە هاتووم
تاڵەئاستانەی تۆدا و لەبەرەبەیانی جەژنێکی نوێدا
ڕەنگی ژیان بگرم وئاوازی خۆشەویستی تۆ
لەهەموو شیعرێکدا دارێژم .. خوات لەگەڵ
ئەی مانگە بەویقارەکەی ساڵ خوات لەگەڵ
پارشێو و تەراویح وبەربانگ ... بەخێرهاتی جەژنی پیرۆزی ڕەمەزان.

# خوات لەگەڵ[٧]

خوات لەگەڵ ئەی مەملەکەتی جوڵە

ئەی کەڤاڵی بەختەوەری و

ڕۆحی سایەی عیبادەت ...

خواحافیز ئەی سێبەری ئازادی ...

ئەی هەنگوینی شفای دڵان...

ئەی مانگی غوفران وقورئان ...

ئەی مەملەکەتی هەناسەکان....

ئێستا تۆ خواحافیزیمان لێدەکەیت وئێمەش لەبن شەستەبارانی

یادگارییەکانی تۆدا ویرد بۆ گەڕانەوەت دەخوێنین ..

بەهیوای میوانی ساڵی ئاینده

خۆمان ئامادە دەکەین ب پێشوازیت...

تالەکردنەوەی یەکەم دەرگای

ڕۆژودا تاژی چاوی کەلەبچەکراوەکانمان بۆ پیرۆزی تۆ بەردەین و

پۆل پۆل بەسروودی نوێی صلاْوات و دروود ڕێچکەی جوانی ببەستین

تابە بوئرەی یاقوتی دڵمانەوە بەری ئەو شەرابە بگرین کەگوناه

سەوزەکا ومرۆڤ بەرەو دۆزەخ دەبا...

خوات لەگەڵ ئەی مەزنترین مانگ ..

ووشەم لەو دارئەرخەوانەی تۆدا ڕشتووە کەلەئەشکەوتی پیرۆزەوە و

لەئاسمانی سامالەوە بۆسەر سینەو دڵێکی صاف و

بێگەرد باری ئەی مانگی جوان

چاوم لێیە بەنەسپایی هەنگاو هەڵئەگریت و
لەدەلاقەی بەختەوەریساڵەوە
جارێکی کە خۆتمان نیشانئەدەی بەم نمایشکردنەت کارگەی
خێروچاکەی ئادەمی دەکەوێتە گەڕو هەموو چراکانی سەر ڕێگا
دادەگیرسێن وسوچێك نامێنێتەوە بۆ تاریکی ،.. خوات لەگەڵ ئەی
ئەو عاشقەی ساڵانە
سەرمان لێئەدەیت و پڕبەم زەمینە سڵاوو سکونەت و ویرد
بەتوێشووی سکینی
خۆتا بۆ ئێمەش پڕئەکەیت لەبەختەوەری .. خوات لەگەڵ
ئەی ملوانکە ئاڵتونییەکەی ملی ئاسمان و دەستبەندە زیوینەکەی
دەستی خاك و ئەی ئەڵقەی دەستگیرانییەکەی پەنجەی شایەتومانی
بەخێرچی سفرەی بەرائەت و بەرامەی یادگارییەکانی ڕۆژی نبوەت و
هاوڕێ بەوەفاکەی بەدرو قەڵغانە بەرگریەکەی فەتح
خوات لەگەڵ ، پەلکە گیایی شەونمی چاوێك کەپڕیە لەئەسرین بۆت
جۆگەی ناودارستانێك کەفێنکایی دەبەخشێت بۆت
خوات لەگەڵ ئەی لانکەی ژیرکەرەوەی ئادەمی و
ئەی ماڵی ئاوێزانی ئاو و تافگە و گەڵا وگوڵ
خوات لەگەڵ ئەی تەیرە ئازاکەی ئاسمانی ساڵ
ئەی مانگە خەرماناویەکەی پەروەردگار
دەڕۆیت وئەمجارەیان لەنێو ئاسمانی ئەوینەوە بەژانێکی تازەی
پێکەنیناوی دا لەدایك ئەبیتەوە و ئەم گێتییە پیسە پاك ئەکەیتەوە

دەڕۆیت وئەمجارە وەك بازێکی چاوتیژ دێیتەوە
بۆکوشتنی شەمشەمەکانی دوژمنی ڕوناکی ، دێیتەوە
لەهەموو ڕێگایەکی قەرەباڵغدا شەیطان ئەکوژی و
لەحەوشەی هەموو ماڵێکدا نەمامێك بەئەمانەتەوە
ئەنێژی ، خوات لەگەڵ ئەی خەندەی دەرونێکی پاك
ئەی شەڕێکی عەدالەت بەرامبەر ئەهریمەنەکانی دژی عیبادەت
تۆدەڕۆیت و لەگەڵ خۆتدا صندوقەکانی ئێمەش دەبەیت
دەڕۆیت ولای خودا نمایشەکانی ئێمە پێشکەش ئەکەیت
ئازیزم هەردەڕۆیت توخوا بەرلەڕۆیشتن بەرلەماڵئاوایت
بەرلەگەڕانەوەت کردەوەکانم لەفکەو لای خۆت هەڵیانگرە
تائەو ڕۆژەی منیش دەگەڕێمەوە بۆ ئاستانەی خواوەند و
هیچ شك نابەم فریامکەوێ جگەلەم سی ڕۆژەی کەلەگەڵ تۆدا ژیام
هیچ تروسکاییەك نابینم جگەلەم سی شەمعەی
لە سی شەودا دامگیرساند
هیچ شك نابەم جگەلەسێبەری ئەو سی دارەی کەهەموو ڕۆژێك
مەتارەیە ئاوم دەکردە بنیان بۆ سەوزبوون
تۆدەڕۆیت توخوا ئێمەش لەگەڵ خۆت بەرە ، تادوای خۆت
ئێمە ڕوتنەبوینەتەوە ، ئێمەش بەرە بۆلای ئەو خەرمانەی
برسێتی نازانێ بمانبە بۆلای ئەو کانیاوەی تەنها پەرداخێ ئاومان
بمانبە بۆلای ئەو سێبەرەی کەلەحەوت کۆمەڵەوە نزیکن
خوات لەگەڵ شعری جوانی

خوات لەگەڵ مانگی میوانی

خوات لەگەڵ کانیاوی ئاوەدانی

دڵمان بەتۆوە خۆشە کەلەنێومانی

خوات لەگەڵ ئەی سەنگەری بەرگری وەدەنکی ئاوریشمی شارستانی

خوات لەگەڵ

ئەی پیرە هەتاوەکەی تیژپەل

ئەی پەلکە زێرینەکەی زەوی شێداری بەفەڕ

الوداع پەروانەی جۆگەی بەهار و

نێرگزە جاڕی تەمەن

تاکە مانگی عیبادەت و

بکوژی هەزاران سەبەل

الوداع شۆڕەسواری

شەڕی سەحرا

ڕێحانەی قەراغ بانجیلە و

بەرماڵی پشت دایکی وەفا

خوات لەگەڵ مانگی ساباتی خێر هێنەر

ئەی مانگی لابردنی شەڕ

لەگۆڕنانی جەلاد وخوێن

قەتارەی گەرمترین بلوێر

شمشاڵ ژەنی گۆرانی خێر

ئاواز دانەری دلێر

چاوگی جوانی وناخی پڕ خێر
الوداع مانگی بەپێز
ئەستێرەکەی ئاسمانی نیشتمان
شاباڵی دوو ڕکات نوێژ
هزری دڵ وهێزی ئیمانی
تەراویح وپارشێو و ویتر وشەونوێژ
خوات لەگەڵ نەسیمی فانی
قەصیدەیەکی زیوی درێژ
الوداع ئەڵقەی زیکرو عەشقی ئیلاهی
مانگی ڕۆژو ویردو شادی عیبادەت و
سێبەری داری بەسۆز
خوات لەگەڵ مانگی ئازادی
بەخێرهاتی جەژنی شادی
الوداع مانگی بەرەکەت
بەخێرهاتی جەژنی عیبادەت
خوات لەگەڵ پارشێو وبەربانگ
بەخێرت هێنا جەژنی ڕەمەزان
الوداع ئینجانەی دڵ
دڵخۆشمانکە بە دوامەنزڵ
جەژن جەژنی ڕەمەزان
عیبادەتە بۆ ڕۆژووەوان

یاخوا بەخێربێتەوە ناومان
نامەی نیگاری خوای جوان
سروودو هۆنراوەی ژووان
بەخێرهاتی جەژنی ڕەمەزان
الوداع مانگی نووری ساڵ
سوپاسی خوائەکەین یەك ئاواز
ویردی الله اکبر الله اکبر الله اکبر
لەم جەژنەدا ئەیکەینە سەرمەشق وڕەهبەر
هەوری بەهاری دەریایە بۆگرۆی بەشەر
جەژن خۆشی وشادی وخێرە یاخوابەخێربێتەوە
خەم لادەبا ئاشتی دێنێ گەروی دڵان دەشواتەوە
جەژن جێژوانی ئەوینە دێتە میوانی هەمووماڵێ
لەدوای مانگی عیبادەت دێتەوە ناومان ساڵی جارێ
کەهەرجارەی لەوەرزێك دێت جەژن گوڵە شنەی بایە
ماڵی باخچەی پایزیش بێ بۆئەم وەرزی سەوزەگیایە
جەژن میحرابی نوێژێکە کەخۆشیەکەی سوژدەگایە
کۆڕی عەشقی گەرمترە خودا ناسی لەمەئوایە
جەژن خۆشی دەربڕینە چوون ئەوینی لەهەگبایە
بەخێرهاتی جەژنی ڕۆژووەوان
الوداع مانگی قورئان

کۆتایی................

خودایە ..
سی ڕۆژە ئەم دڵەی من شەڵاڵی خوێنی مانگ بوەو
توند چەقیوەتە سەر دڵی ئەرز
هەموو گۆرانی و هۆرەیەکی لە سیناریۆیەکدا داڕشتووە کە ڕۆژووە
هەموو ئیقاعێکی تابلۆیەکی ڕەنگ کردووە کە پارشێوە
هەموو تیانووسێکی بە قەڵەمێك رەش کردووە کە تەراویحە
هەموو زەمزەمی وتفەنگێکی لەشاخێکدا هەڵواسیوە کە بەربانگە
خودایە...
ئەم کۆتا بەربانگەی من بکە...
بەخشتی خەزێنەی خێرم تالەخەرجی
دروستکردنی ماڵێکدا بکەمە یەکەمین مەصرەفی ژیان